د. عوسمان محەممەد غەریب

# فەلسەفەی ئاوێنەبوون



## چۆن دەبیتە ئاوێنە و، کێ دەکەیت؟





# فەلسەفەی ئاوێنەبوون

## چۆن دەبیتە ئاوێنە و کێ دەکەیت؟

---

د. عوسمان محەمەد غەریب






ناوی کتێب: فەلسەفەی ئاوێنەبوون

چۆن دەبیتە ئاوێنە و، کێ دەکەیت؟

نووسەر: د. عوسمان محەمەد غەریب

نۆبەی چاپ: یەکەم -٢٠١٤

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (٢١٨٠)ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێ دراوە

## تەنها بەناوی خودای گەورە و میهرەبان



## دەستپێك

سوپاس و ستایش بۆ خودای تـاك و تـەنیا، درورد و سـەڵات و سـەلامیش لەسـەر پێشـەوامان محەمـەد و یـار و شـوێنکەوتوانی بەگشتی.

تۆش خوێنەری ئازیز و خۆشەویست، لە هەرکوێ هەیت سڵاوی خودای گەورەت لێ بێت:

زۆرن ئەوانەی بە باشـە باسـی ئاوێنـە دەکـەن و، ئاوێنـەیان لا خۆشەویستە، چونکە ئاوێنە جوانیی لاشەو قەد و بـاڵا و ڕواڵـەتیان دەردەخات و، وایان لێدەکات زیاتر متمانە بە خۆیان بکەن.

لە بەرامبەردا، کەسانێکی زۆرتر بەدی دەکرێن، کە چـاویان بـە بینینی ئاوێنـە بـەرایی نایـەت و، حـەز ناکـەن چـاویان بـە چـارەی

بکەوێت، چونکە ئاوێنە بزێویی و ناشیرینی ڕواڵەتیان دەردەخات و، متمانەیان بە خۆیان دەهەژێنێت.

باشە، چی ئەبوو ئەگەر ئاوێنە، ناخ و دەروونمانی ئاشکرا بکردایە و، پەردەی لەسەر جیهانی شاراوەمانی لا ببردایە؟!!.

ئایا قەت لە بەردەمیدا ڕادەوەستاین؟!!

چی ئەبوو ئەگەر حەقیقەتی قێزەون و تاڵی ئێمەی دەربخستایە؟!! ئایا باوەڕمان پێی دەما، یان بەر هێرشی تانە و تەشەرمان دەدا و، تۆمەتی جیاجیامان دەدایە پاڵ و، بە جاش و خۆفرۆش و تیرۆرستمان دەدایە قەڵەم؟!!



ئایا هەڵوێستمان چی دەبوو ئەگەر ئاوێنـە ئـەو ڕاسـتییە تاڵانـەی کە دەیـەها سـاڵە شـاردوونمانەتەوە، یـا ئـەو درۆ و گەندەڵیانـەی کـە چەندەها ساڵە خەڵکیمان پێ چەواشە کردوون، ئاشکرا بکردایە؟!!

یاخود ئەو تاوانانەی کە بەرامبەر تاك و کۆی کۆمەڵگامان کردوون و، خەڵکانی دیکەمان پێ تاوانبار کردوون و، خۆمان تیایدا وەك مەڕی پەیامبەر دەرخستووە، چی دەکەین گەر ئاوێنە گشت ئەو تاوانانە بـۆ خەڵکی بخاتەڕوو؟!!

ئایا هـەر وەکـو جـاران دەچـووینە بـەردەمی جـەنابعالیان و، بـە ڕاشکاوییەوە سەیری ڕاستیەکانمان دەکرد؟!!!

چی دەبوو گەر ئاوێنە بهاتایەتە گۆ و، نەفرەتی لە کیـان و بـوون و کردار و ڕەفتارمان بکردایە؟!!

چـی دەبـوو گـەر نـەعرەتی بکێشـایە و، بـە دەنگێکـی شـێرانە بینەڕانایـە: ئـەی دەروون پیسـان، بـۆ هەقیقـەتی خۆتـان بـە سـەد پەردەی درۆ و دروستکراو شاردۆتەوە؟!

بۆ دان بە تاوانەکانتاندا نانێن و، دەروونتان ئاسوودە ناکەن؟!!

تاکەی دەستی چەپەڵتان بەسەر چـەند دامـاو و هـەژار و کڵۆڵ و بێتاواندا دەسڕن؟!!

وەرن، با دەمامکی فێڵ و تەڵەکەتان لەسەر دادڕم!!

ئایا هەموومان پێکەوە دانمان بە هەقدا دەنا و، سوپاسی بێپایانی ئاوێنەمان دەکرد، یاخود بەر لێشاوی جنێو و نەفرەتمان دەدا و، بە چەکوش و پێلەقە ورد وردمان دەکرد؟!!

بەڕاستی کاتێك سەیری زۆرینەی مرۆڤی سەردەم دەکەم -بە سەد ئەفسووس و هەزار مەخابنەوە- دەبینم: تەنها هەڵبژاردنی ئەگەری دووەمیان لێ چاوەڕێ دەکرێ.

ئەوەتا لە جیهانی گەیشتن بە لوتکەی زانست و تەکنۆلۆژیای سەردەمدا، بە دوو چاوی سەر دەبینین کە زۆرینەی خەڵکی -هەرچەندە بە ڕواڵەت و گوفتار عەودالی ڕاستیی و هەقیقەتن- هەقیان لا ڕەقە و، گوێیان لە ئاستیدا کەڕە و، چاویان کوێر.

ئامادەن ڕۆژانە چەند کاتژمێرێك لە ژیانی ڕۆژانەیان بە بیستنی سوپاس وستایش و پیاهەڵدان بەرنە سەر و، کاتی زێڕینیان بە فیڕۆ بدەن، بەڵام ئامادەنین گوێ بۆ بیستنی ئامۆژگارییەکی ڕەخنە ئامێز شل بکەن.

ئامادەن تەمەنی ژیانیان بۆ بەدەستهێنانی موڵکی چڵکنی دونیا بەسەربەرن، بەڵام ئامادە نین کەمێك خۆیان ماندوو بکەن و، هاوڕێیەتی کەسێکی مەرد بەدەست بێنن!! هەروەك ساڵح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

﴿ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾ الأعراف: ٧٩.

هۆ گەلۆ: سوێند بەخوا، پەیامی پەروەردگارم بەڕاستیی و، بە چاکیی پێڕاگەیاندن و، ئامۆژگاریم کردن، بەڵام بەداخەوە ئێوە ئامۆژگاریکارانتان خۆش ناوێت.

لەکاتێکدا ئەرکی سەرشانی گشت مرۆڤێکە بە دووی کەسێکی ئاوێنە ئاسادا بگەڕێت و، بیکاتە هاوڕێی گیانی بە گیانی و، تامەزرۆی پەند و، ئامۆژگاریی و، ڕەخنە و، ڕا و، بیروبۆچوون و، هەڵسەنگاندنەکانی بێت.

هاوڕێی ئاوێنە ئاسا هەڵبژێرە، چونکە ئاوێنە ڕەنگدانەوەی خۆت بۆ دەکات، وێنەی خۆت بۆ نمایش دەکات.



بۆیە زۆر کەس دەبینین باوێشك بۆ هاوڕێیەکی دڵسۆز و گیانی بە گیانی دەدەن و، خەونی پێوە دەبینن، بە هەڵەداوان هەوڵی بۆ دەدەن بەڵام چنگیان ناکەوێت!!

خۆشەویستیش وەك ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت:

(هەر مرۆڤێك لەسەر ئایینی هاوڕێکەیەتی، دەبا هەر یەکێك لە ئێوە سەیر بکات کێ دەکاتە هاوڕێی)؟![1]

ئەوە هاوڕێیە لەکاتی تەنگانەدا بە هاناتەوە دێت و، گیان و سەروەت و سامانی بە قوربانت دەکات.

ئەوە هاوڕێیە بە بەردەوام پێت دەڵێ: چاکت کردووە، دەستت خۆش، یا پێت خوار داناوە، ئاگات لە خلیسکان بێت.

ئەوە هاوڕێیە بە بینینی دڵخۆش دەبیت و، غەم و پەژارەت لە بیر دەباتەوە.

ئەوە هاوڕێیە –وەك ئاوێنە– بە پیشاندانی ڕووی گەشت، خەندە سەر لێوەکانت دەخات.

---

[1] – عن أبي هريرة رضي الله عنه: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " **المرء على دين خليله فلينظر أحدكم من يخالل** " رواه أبو داود في سننه –كتاب الأدب – باب من يؤمر أن يجالس، والترمذي في سننه –كتاب الذبائح– أبواب الزهد، وحسَّنه، والحاكم في المستدرك على الصحيحين – كتاب البر والصلة من حديث أبي هريرة –رضي الله عنه–، وقال: صحيح إن شاء الله.

پیاو چاكێك (عَلْقَمَةَ العُطَارِدِيٍّ) لەسەرەمەرگدا ئامۆژگاری كوڕەكەی دەكرد و دەیفەرموو:

كوڕە شیرینەكەم: هاوڕێیەتی كەسێك بكە، ئەگەر خزمەتی بكەی بتپارێزێت، گەر هاوڕێیەتی بكەی بتڕازێنێتەوەو جوانترت بكات، گەر دەستت كورت بوو یارمەتیت بدات و، ئەگەر دەستی خێری بۆ درێژ بكەیت دەسگرۆییت بكات، گەر چاكەی لێت بینی پێی بزانێت و بڵاوی بكاتەوەو، ئەگەر خراپەی لێت بینی چاكی بكاتەوە و لە خەڵكی بشارێتەوە، هاوڕێیەتی كەسێك بكە، گەر داوای لێ بكەی بەبێ دوودڵیەوە پێت ببەخشێت، گەر داوای لێ نەكەیت و بێ دەنگ بیت ئاگاداری حاڵت بێت و بەبێ داوا بە هاناتەوە بێت، ئەگەر تووشی بەڵاو گرفت و كێشەیەك بوویت وەك خۆی سەیرت بكات و كێشەت بۆ چارە بكات.[1]

---

١- " يَا بُنَيَّ إنْ عَرَضَتْ لك حَاجَةٌ فَاصْحَبْ مَنْ إذَا خَدَمْته صَانَك وَإِنْ صَحِبْته زَانَك أيْ حَفِظَك وَإِنْ قَعَدَ بِك مَانَك أيْ حَمَلَ مَئُونَتَك اصْحَبْ مَنْ إذَا مَدَدْت يَدَك لِخَيْرٍ مَدَّهَا وَإِنْ رَآى مِنْك حَسَنَةً عَدَّهَا وَإِنْ رَآى سَيِّئَةً سَدَّهَا، اصْحَبْ مَنْ إذَا سَأَلْته أعْطَاك وإن سكتَّ ابتداك، وَإِنْ نَزَلَتْ بِك نَازِلَةٌ وَاسَاك أيْ جَعَلَك كَنَفْسِهِ". إحياء علوم الدين، للإمام أبي حامد محمد بن محمد الغزالي ت٥٠٥هـ، دار االمعرفة – بيروت:١٧١/٢.

**هاوڕێی ئازیزم؛** بزانه له مێژه گوتراوه: "الصاحب ساحب والجار جارٌ" واته: هەر له یەك هـاوڕێ و دراوسـێ ڕاكێشـەرن، خـراپ بـن بـۆ خراپە ڕاتدەكێشن، چاكیش بن بۆ چاكە.

ئیبن خەلدونیش له پێشەكییەكەیدا دەڵێت: "الطبع لـصٌ سـارقٌ" واته: تەبیعەت و سروشتی مرۆڤ دزه، سروشت و ڕەوشتی دەوروبەری دەدزێت.

نـزیكترین و پـاكترین و چـاكترین هاوڕێیـەتی، هاوڕێیـەتی ئـەم كەسانەی خوارەوەن:

هاوڕێیەتی نێوان ڕۆڵە و باوك و دایك.

هاوڕێیەتی نێوان برا و برا، خوشك و خوشك، خوشك و برا.

هاوڕێیەتی ژن و مێرد.

گـوێ لـەم دەقـە پـیرۆزە قورئانیـەش بگـرن تـاوەكو زیـاتر ئـەم چەمكەتان بۆ بەرجەستە بێت:

﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ ﴾ لقمان: ١٥.

ئەگەر دایـك و باوكـت كۆششـیان لـه گەڵتـدا دەكـرد تـاوەكو بـێ بەڵگە هاوەڵ و شەریك بۆ من قەرار بدەی بەگوێیان مەكە، بـەڵام: لـه دونیادا بەشێوەیەكی جوان هاوڕێیەتییان بكە.

هاوڕێیەتی لەگەڵ باوك و دایكی بێ بڕوادا؟ بەڵێ هاوڕێیەتی!!

برای خۆشەویست، خوشكی هێژا:

هاوڕێیەتی كەسی چاك و سەركەوتوو ژیانت ئاسوودە و، دڵت خۆش و، تەمەنت پڕ لە كامەرانیی دەكات.

هاوڕێیەتی كەسی بەدو خراپ ژیانت تاڵ و، دڵت تەنگ و، تەمەنت پڕ لە مەینەت و نەگبەتی و نەهامەتی و گرفت و كێشەو سەرئێشەو دەردەسەری دەكات.

ئەی قوڕ بەسەر ئەو كەسەی نەزانێت چۆن هاوڕێی ژیان هەڵبژێرێت و، هاوڕێیەتی كەسانێك بكات كە دەبنە مایەی كێشە و گیروگرفت و، تەمەنی زێڕینی پڕ لە غەم و پەژارە و ئاخ و ئۆف دەكەن.

خۆزگە هەریەك لە ئێمە هەستی بە باری ناهەمواری ئەو كەسە بكردایە كە بۆ تەمەنی ژیانی و، هاوڕێیەتی گیانی بە گیانی متمانەی بە كەسێك بەخشیوە و، هەڵیبژاردووە، هەموو ئامانج و ئاواتێك و ئومێدێكی لەودا كۆكردوەتەوە، بەڵام لە پڕێكدا خەونەكانی ژیانی بڕەوێتەوە و، ڕەنجی فەرهادی چەندەها ساڵەی بەبادا بچێت، لە كاتێكی زۆر دژواردا تووشی نەهامەتی و قەیرانێك ببێت، بە هەموو متمانە و دڵنیاییەكەوە ڕووبكاتە خانەی ئەو تەنها هاوڕێ و هاوڕەنگ

و هاودەنگە دێرین و گیانی بەگیانییە و، بەو هیوایەی بەدەم هاوار و نرکە و ناڵەیەوە بێت و، کەمێك بەشداریی غەمەکانی بکات و، لەو کێشەیە دەسگرۆیی و ڕزگاری بکات، تەقە لە قاپی بدات، بەڵام سەد ئەفسوس و هەزار مەخابن، بەپێچەوانەوە –وەك ئەوەی ڕۆژێك نان و پیازێکیان بەیەکەوە نەخواردبێت– خۆی لێ گێل بکات و، لایەکی لێ نەکاتەوە ! !



بیر لە هەستی بریندار و، ڕەنجەڕۆیی ئەو کەسەش بکەرەوە کە گشت تەمەنی لەپێناو کامەرانی هاوڕێیەکدا خەرج دەکات، بەڵام دەبینێت ئەو هاوڕێیەی بە دەستێك تەوقەی لەگەڵ دەکات، بە دەستەکەی تری لە پشتەوە بەر خەنجەری ژەهراویی دەدات و، دەیەوێت ئەنجن ئەنجنی بکات.

ئەبێ لەو کاتەدا ئەو داماو و کڵۆڵە –حاڵمان بە حاڵی نەبێت– حاڵی چۆن بێت؟! !

## خوێنەری هێژا و عەودالی حەقیقەت:

ئەم چەند کاغەزەی لەبەردەستی جەنابعالیتاندایە هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن و ڕاڤە کردنی ئەو دەقە شیرینەی خۆشەویستمانﷺ کە تیایدا بڕواداری بە ئاوێنەی بڕوادار چواندووە.

با پێکەوە چەند ساتێك لە خزمەتی ئەو فەرموودە شیرینەی خۆشەویستداﷺ بەرینە سەر و، بزانین بۆ مرۆڤی بە ئاوێنە چواندووە؟!

دەقی فەرموودە:

خۆشەویست دەفەرموێت: بڕوادار ئاوێنەی بڕوادارە و، بڕوادار برای بڕوادارە.[1]

هەروەها لە جێگایەکی تردا دەفەرموێت: هەریەکە لە ئێوە ئاوێنەی براکەیەتی، ئەگەر تۆز و گەردێکی بەسەرەوە بینی با لایبات و، پاکی بکاتەوە.[1]

---

١- سنن أبي داود – كتاب الأدب، باب في النصيحة والحياطة عن أبي هريرة –رضي الله عنه–، عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: " المؤمن مرآة المؤمن، والمؤمن أخو المؤمن، يكف عليه ضيعته، ويحوطه من ورائه".

حەسەنی بەسریش دەیفەرموو: کاتی خۆی دەیانفەرموو: موسوڵمان ئاوێنەی براکەیەتی، ئەوەی کە خۆی لەخۆیدا نایبینێ ئەو پیشانی دەدات.[2]



---

١- سنن أبي داود -كتاب الأدب- باب في النصيحة والحياطة - والأدب المفرد للبخاري - باب المسلم مرآة أخيه. عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " إن أحدكم مرآة أخيه، فإن رأى به أذى فليمطه عنه "

وفي الباب عن أنس كما في سنن الترمذي الجامع الصحيح - الذبائح- أبواب البر والصلة عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب ما جاء في شفقة المسلم على المسلم-.

٢- المطالب العالية للحافظ ابن حجر العسقلاني - كتاب الطب-باب حق المسلم على المسلم: عن جابر بن عبد الله رضي الله عنه، عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: **"من أكرم أخاه المسلم فإنما يكرم الله عز وجل"** وقال أحمد في الزهد: ...عن الحسن، قال: " كانوا يقولون: إن المسلم مرآة أخيه يريه منه ما لا يرى من نفسه".

# 1

# وێستگەی یەکەم

# جۆرەکانی ئاوێنە

**ئاوێنە سێ جۆری هەیە:**

**ئاوێنەی قۆقز (کۆپ):** ئەم جۆرە ئاوێنەیە وێنە بچووك دەکات، ئەم جۆرە ئاوێنە بۆ ئۆتۆمۆبیلەکان بەکاردێن بۆ ئەوەی وێنەی پشتەوەی خۆیان بەشێوەیەکی بچووککراوە ببینن.

**ئاوێنەی قووڵ (ناو چاڵ):** ئەم جۆرە ئاوێنەیە وێنە گەورە دەکات، ئەم جۆرە ئاوێنە بۆ بەدەستهێنانی وزەی خۆر بەکاردێت و، لە ساڵۆنی ڕازاندنەوە و سەرتاشیندا سوودیان لێ وەردەگیرێت.

**ئاوێنـەی تـەخت (ڕێك):** ئـەم جـۆرە ئاوێنەیـە، نـە وێنـە گـەورە دەكات و، نە بچووكی دەكات، بەڵكو وەك خۆی پیشانی دەدات.

بەمەش دەردەكەوێت مەبەستی خۆشەویست ﷺ ئاوێنـەی ڕێكـە نەك ئاوێنەی قۆقز و كۆڕ یاخود ناو چاڵ و قووڵ.

بۆیە دەبێت نە وێنەكان گەورە بكەین و، نە بچووكیان بكەینەوە.



# 2

# وێستگەی دووەم

# بنچینەی زاراوەی ئاوێنە

ئاوێنە

## زاراوەی ئاوێنە:



لە بنەڕەتدا وشەیەکی لێکدراوە، لە هەر دوو وشەی (ئاو) و (وێنە) پێکهاتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئاوێنە وەك ئاوی ڕوون وێنەکان وەك خۆیان بێ ڕتووش پیشان دەدات، واتە: ئاوێنە ئەو ئامرازەیە کە خۆمانی تێدا دەبینین.

هۆکاری بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مـرۆڤ یەکەمجار وێنەی خۆیان لە ئاودا بینیوە، بۆیە ناوی ئاوێنەیان لێنا کە بە واتـای وێنـەی نـاو ئـاو دێـت، باوباپیرانمـان دواتـر کاتێـك کـە ئـەو ئامرازەیان دۆزیەوە کە بە عەرەبی پێی دەوترێت (المرآة) هەمان ناوە کۆنەکەیان لێنا و، بە (ئاوێنە) ناویان دەبرد.



3

## وێستگەی سێیەم

# ڕەوانبێژیی لە فەرموودەکەدا



هونـەری لێـك چـواندن (تەشـبیه) –وەك لای پسـپۆڕانی زانسـتی بەلاغە و ڕەوانبێژیی ئاشکرایە– پێنج جۆری هەیە:

التشبیه التام (چواندنی تەواو): ئەو چواندنەیە هـەر چـوار پایـەی چواندنی تێدا بێت:

١– چوێنراو (المشبه).

٢– پێ چوێنراو (المشبه به).

٣– ئامرازی چواندن (أداة التشبیه).

٤– ڕووی چواندن (وجه الشبه).

**نموونە:**

**ئەخۆلی شاعیر دەڵێت:**

**شەرتە وەك یەعقوب لە دەوری، یوسفی گوم گەشتەكەم**
**بـۆ دڵــەی وێــڵ و غــەریبم، دائیمــە بگــریم بــە زار**

ئـەخۆلی شـاعیر لێـرەدا خـۆی چـواندووە بـە یـەعقوب پێغەمبـەر (سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ)، ڕووی چـواندنەكە گریانـە بـە دووی ونبوویەك، كە لای یەعقوب پێغەمبەر یوسفی كوڕیەتی و، لای ئـەخۆل دڵی وێڵ و غەریبیە، ئامڕازەكەش وشەی (وەك)ـە.

**١- التشـبیە المرسـل:** ئـەو لێكچـواندنەیە كـە ئـامڕازی چـواندنەكەی تێدابێت.

نموونە: (دەڵێی بەڕوو لە دەمیدا تەقیوە) مەبەستی توانج گرتنـە لەو كەسەی كە قسە ناكات و بێدەنگە، ئەم پەندەیە ئامڕازی چواندنی تێدایە كە (دەڵێی)یە.

**٢- التشبیە المؤكد:** ئەو لێكچواندنەیە كە ئامڕازی چـواندنەكەی تێـدا نەبێت.

**نموونە: خوشکی بێ برا ماڵی بێ چرا.**

**سەلکی سیری یان قنچکی پیازی!**

لەم دوو نموونەدا ئامرازی چواندن دیار نیە و باس نەکراوە.

**٣- التشبيه المفصل:** ئەو چواندنەیە کە ڕووی چواندن (وجه الشبه)ی تێدا بێت.

**نموونە:**

**خەڵکی ساکارت گەڵێ بـە شـەڕدا**
**لە مێژە گورگی لە پێستی مـەڕدا**

"دەڵێی کەری ناو جۆگەیە لە هەر دوو بەر ئەلەوەڕێ" ئەم پەندە بۆ کەسێك دەوترێت لە دوو لای جیاوازەوە بخوات.

لەم دوو نموونەدا ڕووی چـواندن دیـارە، ئـەویش هـەردوو بڕگـەی **(خەڵکی ساکارت گەڵێ بە شەڕدا)** و **(لە هەر دوو بەر ئەلەوەڕێ)**یە.

**٤- التشبيه المجمل:** ئەو چواندنەیە کە ڕووی چواندن (وجه الشبه) ی تێدا نەبێت.

بۆ نموونە بە کەسێك دەڵێن:

**"دەڵێی شێرە"** واتە: لە ئازایەتی و چاونەترسیدا.

"دەڵێی پشیلەیە" واتە: سپڵەیە.

"دەڵێی مەڕی پێغەمبەرە" واتە: بێ زەرەرە.

"دەڵێی مووی لووتە" واتە لێت نابێتەوە.

٥- التشبية البليغ: (چواندنی ڕەوان) ئەو چواندنەیە کە نە ئامرازی چواندنەکە و، نە ڕووی چواندنەکەی تێدابێت.

بۆ نموونە بە کەسێك دەڵێن: ماستاوچیە، واتە بۆ مەبەست و بەرژەوەندیی تایبەت زۆر خۆی لە پیاوی گەورە دەباتە پێشەوە و، خزمەتی دەکات.

بەهێزترین جۆری تەشبیە لەڕووی مانا و بەلاغییەوە جۆری پێنجەمە کە پێی دەوترێت "تەشبیهی بەلیغ".

ئەم فەرموودەیەی خۆشەویستیشﷺ لە تەشبیهی بەلیغە و، بەهێزترین جۆری تەشبیهە، بۆیە ئەو چەمك و مانا جوانانەی لە ئاوێنەدا هەن گشتیان مەبەست و ویستی خۆشەویستنﷺ.

ئەم نامیلکەیە تەنها نموونەی دڵۆپێکە لە دەریای بێ پایانی مەبەستی جوان و، فەلسەفەی ئاوێنەبوونی مرۆڤەکانە لە دیدی خۆشەویستداﷺ.

4

## وێستگەی چوارەم

# بزانە کام ئاوێنە هەڵدەبژێریت؟...

وەك باسمان كرد هەموو ئاوێنەیەك بەكەڵكی ئەوە نایەت بیكەیتە هاوڕێ و هاودەمی خۆت و، هەمیشە چاوەڕێی كەرەم و ئامۆژگاری لێ بكەیت، دەبێت چاك بزانیت ئاوێنەی ژەنگاوی یا قۆقز یا ناو چاڵ و قووڵ بە كەڵكی هاوڕێیەتی نایەن و، ڕاستییەكانت لێ دەشێوێنن.



هەڵبژاردنی هاوڕێش بەهەمان شێوە دەبێت و، ناکرێت هەموو کەس بکەیتە دۆست و هاوڕێی خۆت.

لە هەڵبژاردنی هاوڕێدا دەبێت پێت بە قەدەر بەڕەکەی خۆت ڕابکێشی، ئاستی خۆت بزانیت، هاوڕێیەتی کەسانی موفتە خۆر و مشەخۆر نەکەیت، منداڵ و مەزم نەکەیتە هاوڕێت، لە خۆت بالاتر نەکەیتە دۆستت.

**پەندە شیعر:**

یا مەبە دۆستی، فیلەوان، کاکە
یا لە قەدەر فیل، خانوو پەیداکە
دانووم ناکولێ لەگەڵ موفتە خۆر
دەست بۆ گیرفانی، نابا بە هیچ جۆر
عومری موفتە خۆر، کەم بێ، بە کەڵکە
چون هەتا بژی، سەرباری خەڵکە

هەروەها نابێت داوای ئامۆژگاریی و ڕاوێژکاریی لە هەموو کەسێك بکەیت، چونکە هەموو کەس شایانی متمانە و ڕاوێژکردن نین.

هەموو هاوڕێیەکیش کەڵکی ڕاوێژکردنی نییە، پەنجەکانی دەستیش دووانیان وەك یەك نین.

مەرج نییە دەیەها و سەدەها و هەزارەها هاوڕێ لە دەوری خۆت کۆبکەیتەوە، چونکە لە تاقیکردنەوەدا کەمیان سەرکەوتوو دەبن، هەزار هاوڕێی بێ سەر و بن، بە قوربانی یەك هاوڕێی دڵسۆز و بەئەمەك بن.




بە داخەوە ئێستە گەنجانمان لە بەردەم هێرش و تەوژمی شۆڕشی تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی ئینتەرنێتدا خۆیان نەگرتووە و، تووشی نەخۆشی فرەکردنی هاوڕێی کەس نەدیو و کەس نەناس بوون، زۆرجار بەناوی درۆ و، تەمەنی درۆ و، وێنەی درۆ و، ئاستی زانستیی و کۆمەڵایەتیی درۆوە خۆیان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی فەیسبوك و تویتەردا بە خەڵکی دەناسێنن، بەڵکو زۆرجار بۆ گاڵتەکردن بە خەڵکی و حەیا بردنیان، دەبینیت ڕەگەزی نێر بە ڕەگەزی مێ، یان ڕەگەزی مێ بە ڕەگەزی نێر خۆی پیشان دەدات و دەناسێنێت، خەڵکی وا دەزانن نێرە بەڵام مێیە، یا وادەزانن مێیە بەڵام نێرە ! !.

**پەندە شیعر:**

بـۆ تاقـە دۆسـتێ، خـۆت پـیر و کـوێر کـەی

نەك ڕۆژی چـەند دۆست، بـە ماڵـت فێـر کـەی

تابتوانیت نهێنی خۆت لای کەس باس مەکە و مەدرکێنە و، داوای یارمـەتی و ئامۆژگـاری لـە کـەس مەکـە، هـەوڵ بـدە ئـەو هاوڕێیـە بدۆزەرەوە کە نهێنیەکانت لای کەس نادرکێنێت و، دەتوانێت دەستی یارمەتیت بۆ درێژ بکات و بە هاناتەوە بێت، بە گوێی عـەقڵ و هۆشـی ڕووناکبیری گوێ لە کێشەکانت بگرێت، خاڵـە لاواز و بـەهێزەکانت بـۆ دیـاری بکـات، ڕێگـا چـارەت بـۆ بدۆزێتـەوە و، برینـەکانت بـۆ سـارێژ دەکات.



**پەندە شیعر:**

دۆستت تا نەبێ، وەك خۆت دڵ بە کوڵ
بۆی هەڵمەڕێژە، خێرا کیسەی دڵ
ئەو کەسە دۆستی، گیانی گیانیتە
هاوڕێی نەبوونی و، لێقەومانیتە
دەرد و مەینەتی، دونیات بەسەرێ
قۆڵت لە کراس، نەهێنییە دەرێ
لە کات و دەمی، تەنانەت مەرگا
تا دەکرێ ددان، بگرە بە جەرگا

نەکەی هاورێیەتی کەسێکی ناشیاو بکەیت و خۆت بکەیتە قوربانیی لەکاتێکدا سوودێکت پێ نەگەیەنێت، بەڵکە دەیەها کێشە و دەردەسەری و گرفتت بۆ بنێتەوە و، جگە زرکە تاڵ بەرێکی نەبێت، ئەو کات ئەو پەندە دێرین و زێرینەی پێشینانمان بتگرێتەوە کە تیایدا دەفەرموون:

**پەندە شیعر:**

خـــۆی لـــە بـــۆ ڕاوچـــی، دەکـــوژێ تـــاژی

تـــا کـــەرێ نـــەبێ، عـــاقڵێ نـــاژی!!

**هاوڕێی ئازیزم:**

بـە بـەراود کردنێکـی زۆر پەلـە لـەنێوان ئـەم دوو کەسـەدا بزانـە کامیان شایستەی خۆشەویستیی و، شایانی هاوڕێیەتیی بەڕێزتانن:

**کەسی یەکەمیان:**

**هاوڕێیەك:** هەمیشە دەرگای دڵیت بۆ واڵا بێت، بـە زەردەخەنـەی سەر لێو و، وشەی جوان و ڕازاوەی مرواری ئاسا پێشوازیت لێ بکات.

**هاوڕێیەك:** لەپێناو بەخشینی ساتێك ئارامی بـە بـەڕێزتان ئـارامی لە خۆی دەبڕێت، لەپێناو بەخشـینی چـرکەیەك خـەو بۆ چـاوەکانت، خەو لە چاوەکانی دەتۆرێنێت.

**هاوڕێیــەك:** بــە هەڵــەداوان هــەوڵ دەدات بــۆ جــارێکی دیکــە زەردەخەنە بە لێوەکانت ئاشنا بکاتەوە، خۆشـی و کامـەرانی بەسـەر گوڵە سیس و ژاکاوەکانی دڵی غەمبارتدا ببارێنێت.

**هاوڕێیەك: لە خۆشی و ناخۆشیەکانتدا لەگەڵتدا بێت و، هەمیشە**

**،ە هاناتەوە بێت، بۆ دەستگرۆیی کردنت هەمیشە لە ئامادەباشیدا**

**،بێت!!**



**هاوڕێی دووەمیان:**

هەمیشە چاوی لە دەستت بێت و، بە بەردەوام بەراوردی نزمیی ئاستی ژیانی خۆیی و، بەرزیی ئاستی ژیانی تۆ بکات، ئیرەیی و ڕق و غەم جەرگی لەت لەت کردبێت!!

**هاوڕێیەك:** پسپۆڕییەکەی تۆراندنی زەردەخەنەی سەر لێوەکانت و، باراندنی فرمێسك و ئەسرینی غەم و ئەشکی خەفەت لە چاوەکانت و، نەخشاندنی گرژیی و مۆنیی نێوچاوانت.

**هاوڕێیەك:** بەرەو هەڵدێرت ببات و، لە ڕاستە ڕێ لات ببات و، پیلان بۆ خلیسکانت دابڕێژێت.



**هاوڕێیەك:** خۆی لە قوللەی قاف و بورج و کەلوی عاجدا و، تۆش لە خواری خوارەوە و ژێر پێ ببینێت!!.

**هاوڕێیەك:** وەك بۆق وابێت، جگە بوقە بۆق و بێزار کردن کارێکی دیکەی نەبێت.

لە پەندێکیشدا هاتووە: بۆق بخەیتە سەر کورسی زێڕیش، هەر بەرەو زەلکاو بازدەدات.

هەندێك مرۆڤیش بۆق ئاسا هەرچەندە بە گەورەی بزانیت و، پلەوپایەی گەورەی بۆ دانێیت، دڵی هەر لە لای زەلكاو و جێگا بۆگەن و نزمەكەی جارانیەتی.

**هاوڕێی ئازیز:** خۆت سەرپشك بە، بزانە كام لەم دوو جۆرە هاوڕێیە شایستەی هەڵبژاردن و هاوڕێیەتیی و دۆستایەتیی بەڕێزتانن؟!!

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە هاوڕێیەك هەڵبژێریت هیچ عەیب و، كەمتەرخەمیی و، تاوانی نەبێت!

ئەو كەسەی بەدووی هاوڕێیەكی بێ عەیبدا دەگەڕێت، بە تەنها دەمێنێتەوە.

ئەو كەسەی بە دووی هاوسەرێكی كامڵدا وێڵە، بە بێ هاوسەر سەر دەنێتەوە.

ئەو كەسەی وێڵ و عەودالی خۆشەویستێكی بێ گرفت و كێشەیە، بە وێڵی دەمێنێتەوە.

ئەو كەسەی دەیەوێت هەمیشە باوك و دایك و، خوشك و برا و، كوڕ و كچ و خزمی دەم بە خەندە و پێكەنین بن، ئەو كەسە هەمیشە بە شەڕ و ئاژاوە ژیان دەباتە سەر، چونكە باوك و دایك و كەسوكاری وای چنگ ناكەوێت.

کەوابوو، با لە هەڵە و تاوان و کەمتەرخەمیی دۆستان و هاوڕێیـان و، خـزم و کەسـوکارمان ببـورین و، لەبـەر هەڵـە و کەمتەرخەمییـەك شیرازەی پەیوەندیمان نەپسێنین.

## دوو قسەی نەستەق:



قسـەی یەکـەم: مـرۆڤ بـە ئارامگرتن لەسەر ئـازاری دڕکـەکان و چـزووی مـێش هەنگوینـەکان، گـوڵی جوان و، هەنگوینی شـیرین بەدەست دێنێت.

قسـەی دووەم: ژووژووەکـان لەبەر ئەو دڕکانەی بـە گیانیانـەوەن، نـاتوانن لەیـەك نزیـك ببنـەوە، بـەڵام کاتێك بای ساردی پایز و زستان ژیانیان لێ تاڵ دەکات، بە ناچاری لە یـەك نزیـك دەبنـەوە و، بـۆ ئـەوەی خۆیـان گـەرم بکەنـەوە بەرگـەی ئاژنینی دڕکی یەکتر دەگرن.

هـەر کاتێـك هەسـت بـە گـەرم بوونـەوە بکـەن، لـە یەکـدی دووردەکەونـەوە، بـەڵام هـەر ئەوەنـدە کزەبـا و زوقمـی سـەرما

دەیانتەزێنێتەوە، دووبارە لەیەك نزیك دەبنەوە و، بە نزیکبوونەوەیان



خۆیـــان لەســـەرما و مەرگ ڕزگار دەکـەن، بەم شێوەیە لـەنێوان نزیك بوونەوە و دوور کەوتنەوەدا دەژین.

نزیك بوونەوەیان دەبێتە هـۆی برینـداربوونیان، بـەڵام لـە هـەمان کاتدا دەبێتە هۆی دەربازبوونیان لەسەرما و سۆڵەی زستان.

ژیانیش بە هەمان شێوە، پڕە لە دڕك و داڵ و تاڵی و ناخۆشـی و ناهەمواریی، ئەگەر بەرگەی هەڵـە و دڕك و داڵ و تـاڵیی دەوروبـەرمان نەگرین، ژیان ناچێتە سەر.

## سێ چرپە:

**چرپەی یەکـەم:** هـاوڕێی ئاوێنـە ئاسـا وەك دەنکـە شـەکر وایـە، ئەگەر بیشتوێتەوە تامێکی شیرینت بۆ بەجێدەهێڵێت.

**چرپەی دووەم:** ئاژەڵێکی هاوڕێ زۆر زۆر باشـترە لـە هاوڕێیـەکی ئاژەڵ.

**چرپەی سێیەم:** مرۆڤ لە ژیاندا وەك قەڵـەمی ڕەساس وایـە، بـە هۆی نووسینەوە بەرە بەرە نووکی دەشکێت و، لەبـەر ئـەوەی جـوان بنووسێت بە قەڵەمدان تیژ دەکرێتەوە، تا وەکو وای لێ دێت جـوانیی وشەکان و، نیگای نیگارەکانی نەبێت هیچی نامێنێت.



# 5

## وێستگەی پێنجەم

# ئاوێنە وێنەی تۆ دەردەخات، نەك وێنەی خۆی، باسی تۆ دەکات نەك باسی خۆی...

هەموومان دڵنیاین لەوەی کە ئاوێنەی پاك و ڕوون و بێگەرد لە شێواندنی شێوەی ئێمەدا هیچ ڕۆڵێکی نیە، بەڵام هەندێکمان کاتێك سەیری ئاوێنە دەکات و، شێوەی شێواوی خۆی دەبینێت، گلەیی و سەر زەنشتی ئاوێنەکەی دەکات، لە کاتێکدا دەزانین ئاوێنە گەر کەسێکی جوان و پاك و ڕوو گەش و دەم بە



خەنــدەی بێتــە بــەردەم، بــە جـوان و پــاك و ڕووگــەش و دەم بەخەندەوەی پیشان دەدات.

ئەگەر کەسێکی ناشیرین و، چڵکن، و مۆن و، ڕوو گرژ و، تووڕەی بێتە بەردەم، بە ناشـیرین و، چـڵکن، و مـۆن و، ڕوو گـرژ و، تـووڕەی پیشان دەدات!!

ئەگەر بتەوێت ئاوێنەکـەت بـەجوانی پیشـانت بـدات و، لـە دیـدی ئەودا جوان ببیت، لەبری سەرزەنشـت و لۆمـەی ئاوێنـەی بـێ تـاوان، هەوڵ بدە خۆت جـوان بکە!



بـە هـەمان شـێوە لەکاتێکـدا هەریـەك لـە ئێمــەی مــرۆڤ خــۆی دەناسێت و، لە زۆر لە کەم و کورپی و هەڵە و نەخۆشـیەکانی خــۆی ئاگادارە، بەڵام کاتێك داوا لە کەسـێك دەکـات هەڵیسـەنگێنێت، چـاوەڕێی ئـەوەی لێ ناکـات هەڵــە و کــەم و کورپیــەکانی پیشــان بــدات، بــەڵکو دەبێــت تــەنها

پیاهەڵدان و، ستایش کردن و، باسکردنی جوانیی و، لێهاتوویی و، زیرەکیی و، ئاستی بەرزی عەقڵ و تێگەیشتنی بکات.

بەم شێوەیەش هەقیقەتە تاڵەکان دەشاردرێنەوە و، ڕاستییەکان ئاوەژوو دەکرێن و، زمانی ڕاست گرێ دەدرێت! !.

بۆیە گەر کەسێك -بە پێچەوانەی ویستی ئەوەوە- ڕاستی و هەقیقەتەکان دەربخات و، ئامۆژگاریی بکات، ئاگاداریی کەم و کوڕیی و نەخۆشیەکانی بکاتەوە، دەبینین لێی زویر دەبێت و، دەیەها ناو و ناتۆرەی لێ دەنێت و، تاوانباری دەکات!.

ئەزموون و تاقیکردنەوە زانستییەکانی قوتابخانە و کۆلێژەکان بەرجەستەترین نموونەی ئەم چەمکەن.

خودی قوتابی دەزانێت لە چ ئاستێکی نزمدایە و، دەزانێت لە خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەکان تا چ ڕادەیەك کەمتەرخەم بووە، بەڵام لەکاتی بڕوانامە وەرگرتندا کاتێك چاوی بە هێڵە سوورەکانی ژێر سێ سفرە چاو زەقەکان دەکەوێت، خۆی تووڕە دەکات و، ئامادە نیە بڵێ: سەرنەکەوتنم بەهۆی کەمتەرخەمیی خۆمەوە بوو، نەك مامۆستا، بەڵکو مامۆستای وانە تاوانبار دەکات و، لە وەڵامی پرسیاری هاوڕێ و خزم و خوێشدا دەڵێت: مامۆستا فلان زوڵمی

لێکردووم و، منی خستووە!! قەت لێی نابیستیت بڵێت: کەوتووم،
بەڵکو هەمیشە دەڵێت:
خستمیان، دەریان نەچاندم.



تا ئێستەش گوێمان لە
بیستنی هەقیقەت کەڕە
و، چاومان لە بینینی
کوێرە.

ئامادە نین دان بە
هەڵەکانماندا بنێین و، تاڵی
هەقیقەت قبوڵ بکەین.

بەم شێوەیەش
ئاوێنەیی خۆمان لە
دەست دەدەین و،
دۆستایەتی
ئاوێنەشمان دەکەوێتە ژێر
پرسیار و لەرزینەوە.

# 6

## وێستگەی شەشەم

# ئاوێنە باسی خۆت بۆ دەکات نەك باسی خۆی..

مرۆڤی هۆشمەند و عاقڵیش خۆی لە باسکردنی خۆی بە دوور دەگرێت و، بیر لە حەز و ئارەزووی بەرامبەرەکەی دەکاتەوە، نەك حەز و ئارەزووی خۆی، باسی جوانییەکانی ئەو دەکات نەك کاژێرێك و دووان داینیشێنێت و باسی خۆی بۆ بکات.

**دیل کارینجی (Dale Carnegie)**[1] دەڵێت: "زۆر حەزم لە فراولە و قەیماغ بوو، بەڵام کاتێك دەڕۆیشتم بۆ ڕاوەماسی لەبری فراولە و

---

١- نووسەرێکی ناوداری ئەمریکییە، خاوەنی چەند کتێبێکە، ناودارتریان کتێبی (How to Stop worrying and Start Living) وەرگێڕدراوەتە سەر چەندین زمان، لە ساڵی ١٩٥٥ز بە شێرپەنجەی خوێن کۆچی دوایی کردووە.

قـەيماغ، كـرم و كوللـەم دەخسـتە هەگبەكەمـەوە، چـونكە دەمزانـی ماسیەكان حەزیان لە كرم و كوللەیە، نەك فراولە و قەیماغ، بیرم لەوە دەكردەوە ماسیەكان چیان دەوێت، نەك خۆم چیم دەوێت".

هـاوڕێی دڵسـۆزیش زۆر خـۆی لـە وشـەی (مـن) دوورەپـەرێز دەگرێت، (من) پڕە لە خۆویستن و خۆپەرستن، زۆربـەی خـەڵكی بـە دەوری (من)دا دەسوڕێنەوە و تەواف دەكەن، (من) بتێكی شـاراوەیە و زۆرینەی خەڵك دەیپەرستن!.



چی دەبێت تۆش وەك (دیـل كـارینجی) لـەكاتی دانیشـتن و نزیـك بوونـەوەت لـە خـەڵكی بـە گشـتی و هاوڕێكانـت بەتایبـەتی باسـی

خۆیانیان بۆ بکەی، نەك باسی خۆت و بە شان و بالآی خۆتدا بخوێنی.

خەڵکی مەجبوور نییە بۆ بیستنی داستانی پڕ لە شکۆ و ئازایەتیی و مەردایەتیی و پاڵەوانیەتیی و جوانیی و وەسفی قەد و بالآی جەنابتان کاتی خۆی بەفیڕۆ بدات!

ئێمە بەداخەوە کۆڕو کۆبوونەوەمان بە باسی پاڵەوانیی و لێهاتوویی و زیرەکیی و جوانیی خۆمان گەرم دەکەین، وا وەڵامی پرسیارە سەختەکانم دایەوە! وا بەبێ ترس بەرەنگاری ئەو زاڵمە بوومەوە، وا هەڵسام، وا دانیشتم، وا بردمەوە، وا ڕۆشتم، وا هاتمەوە، وا سەرکەوتم، وا ئازا بووم، وا بەجەرگ بووم!!

وەنەبێ باسی چاك و خراپ، یا ڕاستیی و هەڵە و، خاڵە ئەرێی و نەرێییەکانی خۆمانیان بۆ بکەین، بەڵکو تەنها باس باسی چاکە و ڕاستی و خاڵە ئەرێییەکان دەخەینەڕوو.

بەم شێوەیە، گوێی خەڵکی بە ستایش و پیاهەڵدانی خۆمان پڕ دەکەین و، کۆڕی دانیشتنمان تەنها بریتییە لە کۆڕی خۆویستیی و، خۆپەرستیی.

7

# وێستگەی حەوتەم

# هەموومان پێویستمان بە ئاوێنە هەیە..

خوێنەری ئازیز: جوان گوێم بۆ بگرە، ئەگەر دەتەوێت شادومان بیت پێویستە ڕاستیی و هەڵەکانت بزانیت، خاڵی لاواز و بەهێزت دیاری بکەیت، ئەم کارەش تەنها بەچاوی خۆت ناکرێت، چونکە چاوەکانت خۆت نابینن، بۆیە خوای گەورە و میهرەبان بۆ بینینیی ئەو خاڵانە دوو چاوی گەش و بێگەردی ئاوێنە ئاسای هاوڕێ دڵسۆزەکەتی بۆ دروست کردوویت، لەڕێی دوو چاوی ئەوەوە هەڵە و ڕاستییەکانت دەبینیت، تۆز و غوبار لەسەر لاشە و جلوبەرگت لا دەبەیت.



ئامان سەد ئامان، دەستم دامێننتان نەکەن وا بزانن پێویستتان بە بوونی هاوڕێی ئاوێنە ئاسا نیە و، ئامۆژگارییەکانی پشت گوێ بخەن، لە دەرئەنجامدا دڵی گەورەی باوك و باپیرانمان بڕەنجێنن و، ئەم پەندە شیرینەیانتان بەسەردا بچەسپێت:

**پەندە شیعر:**

نەسیحەت ناچێت، بە مێشکی کەردا
کێ دیویە بزمار، بڕوا بە بەردا

وا بزانم ئێستە بۆت دەرکەوت چۆن هەموومان پێویستمان بە ئاوێنە هەیە، گەر پرسیار بکەیت و داوای ڕوونکردنەوەی زیاتر بکەیت، بفەرموو بۆ خوێندنەوەی خاڵی پێویستی بوونی ئاوێنە لە ژیانی گشت تاکێکماندا:

١- ئاوێنە جوانیی و ناشیرینی، ڕێکوپێکی و شێواویی، پاك و خاوێنی و چڵکنی خۆمانی تێدا دەبینین.

٢- لەبەردەم ئاوێنەدا خۆمان دەڕازێنینەوە و، جلوبەرگ و پۆشاك و ڕواڵەتمان جوان دەکەین و، قژمان دادێنین.

بۆیە دەبینین خۆشەویستیشﷺ ئاوێنە و کلدانی هەبووە.[1]

هەروەها دەبینین خۆشەویستمانﷺ لە سۆنگەی ئەو ئایەتە جوانەی کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا پێی فەرمووە: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ المدثر: ٤ ، هەر وەك چۆن گرنگی بە پاکیی و جوانی ناخ و دەروون داوە، بە هەمان شێوە گرنگی بە پاکیی و جوانیی ڕواڵەت و سیمای دەرەوە داوە، بۆیە حەزی کردووە دەرەوەیشی وەك

---

١- مراسيل أبي داود – في الترجل– عن خالد بن يزيد، قال: بلغني أن رسول الله صلى الله عليه وسلم " كانت له مرآة ومكحلة.

ناوەوەی پاك و بێگەرد بێت، بۆیە دەبینین هەمیشە سەرنجی یاوەرانی بۆ ئەو چەمکە ڕاکێشاوە.

## دەگێڕنەوە دەڵێن:

جارێکیان خۆشەویست ﷺ لە مزگەوتەکەی خۆیدا دادەنیشێت و، دەبینێت پیاوێك بە قژێکی بژ و، ڕیشێکی ئاڵۆزەوە خۆی دەکات بە مزگەوتدا، خۆشەویست ﷺ فەرمان دەدات کە بڕواتە دەرەوە و، سەر و ڕیشی چاك بکات، ئەویش خێرا دەچێتە دەرەوە و، فەرمانی خۆشەویست ﷺ بەجێدێنێت و، بۆ ناو مزگەوت دەگەڕێتەوە، خۆشەویستیش ﷺ پێی دەفەرمووێت: ئەمە جوانتر و باشتر نییە لەوەی کەسێکتان بە قژێکی بژەوە وەك شەیتان ببینرێت؟!.[1]

---

١- عن عطاء بن يسار، أنه أخبره أنه قال: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم في المسجد، فدخل رجل ثائر الرأس واللحية، فأشار إليه رسول الله صلى الله عليه وسلم أن اخرج، فأصلح رأسك ولحيتك ففعل، ثم رجع فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " أليس هذا خيرا من أن يُلْقَى أحدُكُم ثائرَ الرأس كأنه شيطان ؟ رواه مالك في الموطأ – كتاب الشعر–باب إصلاح الشعر: والبيهقي في شعب الإيمان – التاسع والثلاثون من شعب الإيمان –فصل في إكرام الشعر وتدهينه وإصلاحه،والبيهقي في الآداب– باب في إكرام الشعر وتدهينه وإصلاحه عن عطاء بن يسار، قال البيهقي: هذا مرسل جيد.

ئەبو دەردا (خوا لێی ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە کە خۆشەویست ﷺ پێی فەرموون: ئێوە سبەینێ بۆ لای براکانتان دەچن، خۆتان ڕێك بکەن، جلوبەرگتان جوان بکەن، ولاخەکانتان برازێننەوە تاوەکو لەنێو خەڵکیدا وەك خاڵ دیار و بەرچاو بن.[1]

خواناسی ناودار (إبراهيم بن أدهم) دەفەرموێت: "گەر بەردەوام سەیری ئاوێنەی تەوبە و گەڕانەوە بکەیت قێزەونیی و قەباحەتی تاوانت بۆ دەردەکەوێت".[2]

---

١- روى أبو داود - كتاب اللباس -باب ما جاء في إسبال الإزار والطبراني في المعجم الكبير- باب من اسمه سهل- سهل ابن الحنظلية الأنصاري، والحاكم في المستدرك على الصحيحين- كتاب اللباس- عن قيس بن بشر التغلبي، قال: كان أبي جليسا لأبي الدرداء رضي الله عنه بدمشق وبها رجل من أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم من الأنصار يقال له ابن الحنظلية، وكان متوحدا قلما يجالس الناس إنما هو في صلاة فإذا انصرف فإنما هو تكبير وتسبيح وتهليل حتى يأتي أهله فمر بنا يوما ونحن عند أبي الدرداء فسلم فقال أبو الدرداء: كلمة تنفعنا ولا تضرك، فقال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " إنكم قادمون على إخوانكم فأحسنوا لباسكم وأصلحوا رحالكم حتى تكونوا كأنكم شامة في الناس إن الله لا يحب الفحش والتفحش " " قال الحاكم: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه "

٢- روى البيهقي في شعب الإيمان- التاسع والثلاثون من شعب الإيمان- فصل في الطبع على القلب أو الرين، أن إبراهيم بن أدهم قال: " إنك إذا أدمت النظر في مرآة التوبة بان

(جـوانیی) ئـەو زاراوە ئاشـكراو پەنهانەیـە كـە زانایـانی وەك ئـەفلاتون و هێگـڵ و ئەرسـتۆو كانـت و شـۆبنهاور و... هتـد، لەپێناسـەیدا سەرسـام و سـەرگەردانن، هەریەكـەیان بـۆ ناسـاندنی دیدێكی جیاوازی هەیە.

هەروەك چۆن پێناسەی ئاویان بۆ نەكراوەو، لەئەنجامدا چۆكیان داداوەو گوتویانە: ئاو نە تامی هەیەو، نە بۆن و، نە ڕەنگ، بە هەمان شـێوە لـە پێناسـەی جوانیـدا چـۆكیان داداوەو، شـۆك گرتـوونی و، ئەژنۆیان شكاوە.

لەكاتێكـدا ئـاو ئەوەنـدە تـام و بـۆن و ڕەنگـی خـۆش و جـوان و گەشی هەیە كە كاڵای هیچ وشەیەك پڕ بەری باڵای نەبێت.

چـەمكی جـوانیی و خۆشەویسـتیش بەهـەمان شـێوە باڵایـان لـە كاڵای وشە باڵاترە، بۆیە پەیامبەری ئازیزمانﷺ پێگـەی بـۆ چـەمكی جوانیی داناوە، گشت هەوڵێكی بۆ سـەقامگیری ئـەو بـەها بـاڵا بـەرزە داوە.

---

لك شين قبح المعصية. شعب الإيمان للبيهقي – التاسع والثلاثون مـن شـعب الإيمـان– فصل في الطبع على القلب أو الرين.

لێرەداو لەم دەرفەتە تەسك و كورتەدا ناتوانین پەی بە گەوهەری نێو دەریای بێ بنی ئەم چەمكە لـە دیدی خۆشەویستمانەوە بـەرین، بـەڵام كـورد گوتـەنی: هەشـتێك لەمشـتێك و، مشـتێك نموونـەی خەروارێكە.

پەیامبەر و سەروەرمان بـۆ سـەقامگیریی جـوانیی دڵ و دەروون، تەنگی بەدڵ ڕەق و، دەروون پیسان هەڵچنیوە، هـەردەم بەدەست و دەمی موبارەكی خەریكی پاك كردنەوەی دڵەكان بووە و، توانیویـەتی لــەبری ڕق و كینــە و تۆڵــە و توندوتیــژیی و قێزەونیــی، درەختــی خۆشەویستیی و لێبـوردن و نـەرمونیانیی بچێنێتە نێـو دڵیانـەوە و، پێگـەی سـۆز و میهرەبـانیی بچەسـپێنێت تـا بكاتــە ئــەو ڕادەی ئافرەتێكی سۆزانیی لەشفرۆش لەبەر خاتری ئاودانی سەگێك مـژدەی واڵا كردنـی دەرگاكـانی بەهەشـتی بـۆ جـاڕ بـدات و، ئـافرەتێكی دڵ ڕەقیی بێ بەزەیی لە سزای سزادانی پشیلەیەكدا دەرگـای ڕەحمـەتی لێ دابخرێت و بە دۆزەخ بسپێردرێت.

بۆ (جوانیی گوفتار و ڕەفتاریش) ئەوەمان بۆ دەسەپێنێ كە خوا جوانــە و، جــوانی دەوێ، بۆیــە جــوانیی و پــاكیی بەســەر گشــت بوونەوەرێكـدا سـەپاندووە و، كەسـێكی خۆشـدەوێت گـەر كـارێكی ئەنجامدا بەجوانیی تەواوی بكات.

لەلایـــەکی دیکـــەوە خۆشەویســـتمان تـــەنها بـــەجوانیی دڵ و دەروونمان قایل نابێت، بەڵکو لەگەڵ جوانی دڵ و دەروونـدا، جـوانیی ڕەفتارو، لەگەڵ ڕەفتاردا جوانیی گوفتارمان بۆ بەرهەم دێنێ.

پێمان دەفەرموێ: موسـوڵمان جنێـوفرۆش نییـە، بـەڵکو گوفتـار شیرینە، بۆیە جنێو بە کەس مەدە، جنێو بە مـردوو، بـە زینـدوو، بـە زەمانـە و فەلـەك، بـە کەڵەشـێر و، لـەرز و تـا و، ڕەشـەبا مـەدە، بـۆ هەریەك لەمانەش پەردە لەسەر ڕووی جوانیمـان بـۆ لادەدات، ئـەوەتا بۆمـــان ڕوون دەکاتـــەوە کـــە: جنێـــو بـــە مـــردووان دڵـــی زینـــدوان دەڕەنجێنێ، زەمانـە و فەلـەك دروسـتکراوی خـوای گـەورەن، لـەرز و تـاش گوناهمـان دەوەرێنـێ، بـای ڕەحمـەتیش خێـر و ڕۆزیمـان بـۆ دەبارێنێ.

ئەوەی جێـی سـەرنج و تێڕامانـە، جنێـو نـەدان بـە شـەیتانە، بـۆ ئەمەش پێمان دەفەرموێت: بە شەیتان جنێـو مـەدەن، بـەڵام داوا لـە خـوا بکـەن لـە شـەڕی شـەیتان بتانپارێزێـت،[1] چـونکە لـە لایەکـەوە جنێودان لە مرۆڤی موسوڵمان ناوەشێتەوە و، لەلایەکی دیکەوە جنێو

---

١- ئەم فەرموودانە بە کۆکراوەیی ئیمـامی سـیوطي لـە الجـامع الصـغيردا هێنـاونی و، ئەلبانیش بەڕاستی زانیون.

چەکی مرۆڤی لاوازە، موسوڵمانیش نابێت لاواز بێت، هەروەها بە جنێودان نە شەیتان کەم دەکات و، نە جنێوفرۆشیش زیاد دەکات.

گریمان، بابایەکی هەزار ڕۆژانە یەك ملیۆن جار جنێو بە دەوڵەمەندێك بدات، ئایا فلسێك لە موڵکی دەوڵەمەند کەم دەکات، یا فلسێك دەچێتە گیرفانی خاڵیی کاکی هەژارەوە؟!!

گەر بە وردیش سەرنجی دەقە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە شیرینەکانی خۆشەویستمان بدەین ﷺ چەمکی جوانی و فەلسەفەی جوانیمان بە جوانی بۆ بەرجەستە دەبێت و، بۆمان دەردەکەوێت تا چ ڕادەیەك فەلسەفەی جوانیی لەناو ئەو دەقانەدا جێگای بوەتەوە و، پێگەی بۆ خۆی دروست کردووە!

بۆ جوانی مرۆڤ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ غافر: ٦٤.

دیمەن و شێوازتانی نەخشاندووە و، بە جوانترین دیمەن و شێوە نەخشاندوویەتی.

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ التغابن: ٣.

خـوای گـەورە ئاسمانـەكان و زەويـی بـە حيكمـەتی پـڕی خـۆی دروسـت كـردووە و ئێـوەی نەخشـاندووە و جـوانی نەخشـاندوون و، سەرەنجاميش گەڕانەوە هەر بۆ لای ئەوە.

بـۆ جـوانی ژن و مێـرد؛ ئـبن عـەبباس دەفـەرموێت: مـن حـەز دەكەم بۆ هاوسەرەكەم خۆم بڕازێنمەوە وەك چۆن حەزدەكـەم خـۆی بۆ من بڕازێنێتەوە.[1]

بـۆ جـوانيی بـەرگ و پۆشـاك و ڕواڵـەتمان دەفـەرموێت: بـەرگتان جوان بكەن، ولآختـان جـوان بكـەن تـا لـەنێو خەڵكيـدا خـاڵ بـن، لـە جوانيدا با ديار بن.

بۆ جوانی ئاسمان و گەردوون دەفەرموێت:

﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ﴾ الصافات: ٦

١– عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: " إني لأحب أن أتزين للمرأة كما أحب أن تزين لي ؛ لأن الله عز وجل يقول: ولهن مثـل الـذي علـيهن بـالمعروف ومـا أحـب أن تسـتطف جميع حق لي عليها " لأن الله عز وجل يقول: وللرجال عليهن درجـة " * السـنن الكـبرى للبيهقي – كتاب القسم والنشوز– باب حق المرأة على الرجل – مصنف ابن أبـي شـيبة – كتاب الطلاق– ما قالوا في قوله وللرجال عليهن درجة.

بێگومــان ئێمــه نــزیکترین ئاسمــان لــه زەویمــان بــه جــوانیی ئەستێرەکەمان ڕازاندووەتەوە.

﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴾الملك: ٥

بەڕاسـتی نـزیکترین ئاسمـان لـه زەویمـان بـه کۆمـەڵێ چـرا کـه ئەستێرە و مانگ و ڕۆژن ڕازاندووەتەوە.

جوانیی ڕووەك: بۆ ئەم چەمکەش دەبینین کاتێك قورئـان باسـی ڕووەك و بەرووبوومی ڕووەکیمان بۆ دەکات سەرنجمان بۆ چەند خاڵ و چەمکێکی گرنگ ڕادەکێشێت:

چەمکی یەکەم: چەمکی سوود لێ وەرگرتن (واتـه خـواردن)؛ وەك خـوای گـەورە لـه سـورەتی ئەنعامـدا دەفـەرموێت : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ ﴾ الأنعام: ١٤١.

واتـه: هـەر خودایـه چـەند بـاخ و گـوڵزاری دروسـت کـردووە کـه هەندێکیان بەرز و لق و پۆپدارن که داربەستیان دەوێت و، هەندێکیان نزم و پـەرش و بڵاون داربەسـتیان ناوێـت، هـەر خودایـه دارخورمـا و مەزرا و کێڵگەی بەدیهێناوە که بەرەکانیان له تام و شێوە و ڕەنـگ و بـۆدا جیـان، زەیتـون و دارهەناریشـی دروسـت کـردووە کـه بـەری

هەندێکیان لە تام و ڕەنگ و بۆدا لە یەك دەچن و، بەری هەندێکیان جیاوازن و لەیەك ناچن، لە بەروبوومی بخۆن.

چەمکی دووەم: چەمکی کۆمەڵایەتی؛ بەوەی کاتی دروێنە و بەروبووم لێکردنەوە هەژاران و نەدارانمان لەبیرنەچێت، هەروەك لە هەمان ئایەتی پێشوودا هاتووە: ﴿ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ الأنعام: ١٤١.



واتە: لەکاتی میوەچنین و پێگەیشتن و دروێنەدا مافی خەڵکی و خودا لە بیر مەکەن و حەقیان لێ دەرکەن و خێر و صەدەقەی لێ بکەن، کارێك مەکەن لە ئەندازە بەدەر بێت و، زیادەڕەویی تیابێت، خودا ئەوانەی خۆش ناوێت زیادەڕەویی دەکەن و لە ئەندازە دەردەچن.

چەمکی سێیەم: چەمکی جوانی؛ هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ

﴿ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ الأنعام: ٩٩.

واته: هەر خودایە لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت، ئینجا بەو ئاوە چرۆ و چەکەرەی هەموو جۆرە تۆوێك لە زەوی دەردێنین و دەڕوێنین و، لاسکی سەوزی لێ دەردێنین و، لەویشەوە دەنك و کەلوی سواری یەك و، لە کلۆکی (تۆوی تەلقیح)ی دارخورماش هێشووی پڕ و شۆڕەوە بوو و نزیك، لەگەڵ باغاتی ترێ و زەیتون و بنەهەناری لەیەکچوو و لەیەك جیامان بەرهەم هێنا، کاتی بەرگرتن بە وردی سەیری بەری ئەو دارانە بکەن چۆن پێگەیشتوون، بەڕاستی لەوانەدا بۆ کەسانێك باوەڕدێنن گەلێك نیشانەی خودا هەن.

## جوانیی وڵاخ و ئاژەڵ:

﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾ النحل: ٦.

لە ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ و وشتردا جوانیی و ڕازاوەیی هەیە لەکاتێکدا لە لەوەڕگا (بە تێریی و گوانی پڕ لە شیرەوە) بۆماڵیان دەهێننەوە و، لە ماڵەوە بۆ لەوەڕگایان دەبەن.

﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النحل: ٨

ئەسپ و هێستر و کەریشی، هەم بۆ سوارییی و، هەم بـۆ زینـەت و جوانی دروستکردوون، شتی وەهاش دروست دەکات کە نایزانن.

شیعر:

کە خاکی، خاکی دامەن بە، وەگەر نا، تۆزی بەر بـادی
کە ئاوی، ئاوی گەوهەر بە، وەگەر نا، بڵقی سـەر ئـاوی



8

# وێستگەی هەشتەم

# ئاوێنە ڕاوێژپێکراوێکی ڕاستگۆیە..

ڕاوێـژکاریی کـردن خۆشەویسـتی هەموانـە، کـەس نییـە بـەوەی خەڵکی پرسی پێ بکـەن و، ڕێـز لـە ڕاوبۆچـوونی بگـرن، دڵـی خـۆش نەبێ.

هاوسـەرەکەت: لەوپـەڕی کامەرانیـدا دەبێـت کاتێـك پرسـی پـێ دەکەیت، ڕای وەردەگریت، قورئـانیش پێمـان دەفـەرموێ ژن و مێـرد ئەگـەر ویسـتیان منداڵەکـەیان لـە شـیر ببڕنـەوە بـا بـە پـرس و ڕای هەردووکیان بێت، وەك لە سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٣٣) دا هاتووە:

﴿ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ﴾.

**ڕۆڵەکانت:** کامەرانیی ئەو سات و کاتەیان وەسف ناکرێت کە باوک و دایکیان پرسیان پێ دەکەن و، وەك هاوڕێیەك سەیریان دەکەن.



**فەرمانبەر:** هەست بە گەورەیی و کامەرانیی دەکات کاتێك دەبینێت جەنابی بەڕێوەبەر پرسی پێ دەکات و، حەز دەکات ڕای وەربگرێت.

هاوڕێی ئاوێنە ئاسا هەمیشە بە ڕاوێژکردنیی، جگە لە سوود و قازانج هیچ زەرەر و زیانێکی بۆت نابێت.

## چرپەیەك..

پرس و ڕا وەرگرتن: نامەیەکی ناڕاستەوخۆیە بۆ بەرامبەرت، کە جێی متمانە و، ڕێزی جەنابتانە.

### سەعیدی نورسی و گرنگی ڕاوێژکاری:



زانای گەورەی کورد سەعیدی نورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆمان دەسەلمێنێت کە یەك لە پەنای یەکدا یەکسانە بە: یانزە، نەك بە دوو!.

چونکە بەهای ژمارە یەك یەکسانە بە یەك، واتە بەهای بە تەنها خۆت یەکسانە بە: یەك.

بەڵام کاتێك ڕای کەسێکی دیکەش وەردەگریت و، گوێ بۆ خەڵکی تریش دەگریت و، خۆت بە تەنها بڕیار نادەیت، ئایا دەزانیت بەهای ژمارەییت دەبێتە چەند؟! وا تێنەگەیت بەهای ژمارەییت دەبێتە دوو، بەڵکو دەبێتە یانزە، چونکە یەك لە پەنای یەکدا ژمارەی ١١ دروست دەکەن.

ئەگەر ڕای دوو کەس وەربگریت بەهای ژمارەیی هەر سێکتان دەبێتە: سەد و یانزە، چونکە یەك لە پەنای دوو یەکدا ژمارەی ١١١ دروست دەکەن.

ڕای سێ کەس وەربگریت بەهای ژمارەیی هەر چوارتان دەبێتە: هەزار و سەد و یانزە، چونکە یەك لە پەنای سێ یەکدا ژمارەی ١,١١١ درووست دەکەن.

ڕای چوار کەس وەربگریت بەهای ژمارەیی هەر پێنجتان دەبێتە: یانزە هەزار و سەد و یانزە، چونکە یەك لە پەنای چوار یەکدا ژمارەی ١١,١١١ دروست دەکەن.



9

# وێستگەی نۆیەم

## ئاوێنەش پێویستی بە تۆ هەیە

دەبێت بزانین کە چۆن ئێمە پێویستمان بە ئاوێنە هەیە، بە هەمان شێوە ئەویش پێویستی بە ئێمە هەیە، بۆیە خۆشەویستمانﷺ کاتێك مرۆڤی بڕوادار بە ئاوێنە دەشوبهێنێ دەفەرموێت: (فلیُمِطْ عنه الأذی) واتە: پاك بکرێتەوە و تۆز و گەردی لەسەر لاببرێت.

بۆیە دەبێت بە بەردەوام چاومان لە ئاوێنەکەمان بێت و، پارێزگاریی لێ بکەین، نە خۆمان بیشکێنین، نە بهێڵین کەسێکی دیکە بیشکێنێت.

زوو زوو پاكی بكەینەوە و، تۆز و گەرد و ژەنگی لەسەر لاببەین.



كاتێكیش ویستمان پاكی بكەینەوە دەبێت بە نەرم و نیانی و، لەسەرخۆ و، بە پارچە قوماشێكی پاك و بێگەرد پاكی بكەینەوە.

ئەگەر بە توندی هەوڵی پاككردنەوەی بدەین ئەوا ئەگەری شكاندنی هەیە.

ئەگەر بە پارچە پەڕۆیەكی پیس و چڵكن پاكی بكەینەوە، ئەوە لە بری پاككردنەوەی زیاتر پیسی دەكەین و، چڵكی پەڕۆیەكەیشی بۆ دەگوێزینەوە.

هەروەها ئەگەر بە بەردەوام ئاگامان لێ نەبێت و، پارێزگاری نەكەین، ئەوا یا لە دەستی دەدەین، یا لە سوود و خزمەتی بێبەش دەبین.

مرۆڤی بڕواداریش بەهەمان شێوە پێویستی بەتۆیە، هاوڕێی ڕاستگۆ و سینەسافیش دراوێكی دەگمەنە، دەبێت هەمیشە ئاگاداری بیت و، پارێزگاری لێ بكەیت، نە خۆت بە خراپە باسی بكەیت یا دڵی

بڕەنجێنیت و، نە دەرفەت بە کەسێکی دیکە بدەیت بە خراپە باسی بکات و ناوی بزڕێنێت، یا دڵی بڕەنجێنێت.

خۆشەویستﷺ پێمان ڕادەگەیەنێت: لەلای هەرکەسێك، برایەکی سەرشۆڕ بکرێت و، بتوانێت بەرگری لێ بکات و سەری بخات، بەڵام پشتی نەگرێت و سەری نەخات، خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا لەبەردەم گشت خەڵکدا سەرشۆڕ و زەلیلی دەکات.[1]

دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت، کاتێك خزمەتی ئاوێنە دەکەین، دەبێ بزانین لەڕاستیدا خزمەتی خۆمان دەکەین.

هەروەها کاتێك ئاوێنە فەرامۆش دەکەین و، بەبێ خزمەت بەجێی دێڵین، هەر خۆمان لە دەرئەنجامدا باج و زەرەرەکەی دەدەین.

ئەی نابینین کاتێك ئاوێنە فەرامۆش دەکرێت و، ڕووی جوانی بە تۆز و گەرد دەشێوێنرێت، لەهەمان کاتدا وێنەکانیش دەشێوێنرێن و، تەپ و تۆز دەیانگرێت.

---

١- عن سهل بن حنيف عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: " من أذل عنده مؤمن فلم ينصره، وهو يقدر على أن ينصره أذله الله عز وجل على رءوس الخلائق يوم القيامة " مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين- حديث سهل بن حنيف، وشعب الإيمان للبيهقي - التاسع والثلاثون من شعب الإيمان الثالث والخمسون من شعب الإيمان.

بە هەمان شێوەش کاتێك هاوڕێکانمان فەرامۆش دەکەین و، بە دەم گرفت و کێشە و، خۆشی و ناخۆشی و نەخۆشییەکانیانەوە نابین، لەبەرچاویاندا ناشیرین دەبین و، خۆشەویستیان بۆ ئێمە تۆز و گەرد و ژەنگ دەیگرێت.

بزانە: تۆ و هاوڕێکەت وەك دوو دەست وان، هەریەکەیان کاری خۆی هەیە و، هەریەك ئەوی دیکەیان دەشوات و خزمەتی دەکات، گەر یەکێکیان بریندار بێت، یاخود بشکێت، ئەوی دیکەیان بەردەوام لە خزمەتیدا دەبێت و، تیماری دەکات و، گەر دەستە بریندارەکە کارێکی هەبێ و، نەتوانێت ئەنجامی بدات، ئەوی دیکەیان تا چاك بوونەوەی براکەی، کارەکانی ئەو ئەنجام دەدات و، دریغی ناکات، چونکە جوانیی هەریەکەیان پەیوەستە بە جوانیی ئەوی تریانەوە و، هەردووك بەیەکەوە جوانن.

تۆ و هاوڕێکەت وەك دەست و چاو وان، چاو کاتێك پیسییەك بەسەر دەستەوە دەبینێت ئاگاداری دەکاتەوە، کاتێك دەستێکیان بریندار دەبێت هەردوو چاو بۆی دەگرین، کاتێکیش چاو دەگریت دەستەکان بە نەرم و نیانی فرمێسکەکانی بۆ دەسڕن، هەروەها کاتێك پووشێك دەچەقێتە چاوێکیانە و، ئازاری دەدات، دەستەکان دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکەن و، بە ئارامی دەریدێنن و، لە ئازاری

ئەو پووشە نامۆیە ڕزگاری دەکەن، گە پێویستیشی کرد مەرهەمی برینی دەکەن.

من و هاوڕێکانم، وەك ئەندامەکانی لەش واین، گشت ئەندامەکان سەرقاڵی کارێکە و، خزمەتی ئەندامەکانی دیکە دەکات، بەبێ ئەوەی ڕقیان لەیەکتر بێت، یان ئیرەیی بەیەکتر بەرن و، حەز بە نەمانی بکەن، نە چاو ڕقی لە قاچ و دەستە و، نە دەم و ددانیش ئیرەیی بە دڵ دەبات.

## چرپەیەك:



ئێمە وەك ڕەنگە جیاوازەکانین، ئەگەری ئەوە هەیە من ئەو ڕەنگە نەبم کە حەزی پێ دەکەی، تۆش ئەو ڕەنگە نەبی کە من حەزی پێ دەکەم، یاخود جگە ڕەنگی خۆت ڕەنگەکانی دیکەت بەدڵ نەبێت، جگە ڕەنگی خۆم ڕەنگەکانی دیکەم بەدڵ نەبن، بەڵام بۆ تەواوکردنی تابلۆیەکە پێویستمان بەگشت ڕەنگەکان هەیە.

باپیرانیشمان –هەزار ڕەحمەتیان لێ بێت– لە دێر زەمانەوە فەرموویانە: چەپڵە بە یەك دەست لێ نادرێت.

# 10

## وێستگەی دەیەم

# ئاوێنەکەت لە جێگایەکی بەرزدا بپارێزە.



لەبەرئـــەوەی ئاوێنەکـــەت لـــە شکان بپارێزیت، نابێـت لـەژێر پـێ، یـان لـە جێگایـەکی نزمـدا دایبنێـی، بـەڵکو دەبێـت جێگایـەکی بـەرز و شیاوی بۆ دابین بکەیت.

بـــە هــــەمان شـــێوە دەبێـــت پلەوپایـەی مرۆڤـی هاوڕێـت لا بـەرز بێـت و، بـە چـاوی سـووك سـەیری

نەکەیت و، هەمیشە جێگای لەسەر سەران و، لەنێو دڵان بێت.

چونکە هاوڕێی ڕاست هەموو موڵکی دونیا دێنێت، دۆستی بەوەفا لە گەوهەر گەوهەرتر و، لە ئەڵماس دەگمەنتر و، لە زێڕ و زیو بەنرختره، بەڵام سەد ئەفسووس و هەزار مەخابن، ئەگەر کەسێکمان پارچە زێڕێك، یا زیوێك، یا دینار و دۆلارێك، یا هەر خشڵێکی هەبێت، هەوڵ دەدات باش بیپارێزێت و، لە سندوق و جێگایەکی تۆکمە و دوور لە دەستی چەپەڵی دز و جەردە دەیشارێتەوە و، لەسەر دڵیدا گیرفان بۆ دینار و دۆلارەکەی دەدورێت، بەڵام قەت بیر لە گەورەیی و گرانبەهایی هاوڕێکەی ناکاتەوە، بە بەردەوام خەریکی زویر کردن و، ڕەنجاندن و، سوکایەتی پێ کردنیەتی.

## هاوڕێی خۆشەویست:

لە دیدی قورئان و سوننەت و مرۆڤایەتیدا دروست نییە بە سووك سەیری بوونەوەر بکەیت، نە مرۆڤ، نە ئاژەڵ، نە گیاندار، نە بێ گیان، ئیدی چۆن ڕێ بە خۆت دەدەی سوکایەتی بە هاوڕێکانت بکەیت و، جێگای ڕێز و بەرزیان بۆ دانەنێیت؟!

سوکایەتی کردن بە خەڵکی و، بە چاوی سووك سەیر کردنیان، نەخۆشیەکی ترسناکە، بەڵام بەداخەوە زۆرکەس پێیەوە ئالوودەن.

با بەیەکەوە بچینە خزمەتی زانایەکەی گەورەی وەك (ابن السبکی) خاوەنی کتێبی ناوداری (جمع الجوامع) و گوێی بۆ بگرین چۆن باسی جەنابی ئیمامی (السبکی) باوکیمان بۆ دەکات، دەفەرموێت: لە دالانی ماڵی خۆماندا دانیشتبووم، سەگێکم لێ هاتە پێشەوە، منیش وتم: بێدەنگ بە، سەگی کوڕی سەگ!

باوکم گوێی لێم بوو و، لێم تووڕە بوو!

بە باوکم وت: ئایا سەگی کوڕی سەگ نییە؟!

ئەویش فەرمووی: بەڵێ، بەڵام بە مەرجی گاڵتە پێ نەکردن دروستە بەو شێوەیە بانگی بکەی[1]!.

## پرسیارێك:

گەنجێکی بێ ژنی دوورەپەرێز لە ژنهێنان، بە زمانێکی گاڵتەئامێزەوە ئەم پرسیارەی لە دانایەك کرد: ئایا ڕاستە دەڵێن: پیاو نازانێت گرفت و کێشە چییە تاوەکو ژن دێنێت؟!

---

١- فیض القدیر شرح الجامع الصغیر، زین الدین محمد المدعو بعبد الرؤوف المناوي (المتوفى: ١٠٣١هـ)، نشر المكتبة التجارية الكبرى – مصر، الطبعة الأولى سنة ١٣٥٦هـ:١/١١٥.

پیرەمێردی دانا لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵکو، پیاو بەها و قیمەتی ژن نازانێت تاوەکو تووشی گرفت و کێشەیەك دەبێت!



## داخێك:

منـداڵ بـە شـیری ئافرەتێـك گـەورە دەبێـت، بـە خزمـەت و شەونخونی ئەو گەشە دەکات، لە باوەشـی گەرمیـدا بـە ئـارامی خـەوی لێ دەکـەوێت، لـە سـایەی سۆزی بێ هاوتای ئـەوەوە فێـری نووسـین و خوێندنـەوە دەبێـت، ئـەمیش بـە بـەردەوام دەبێتـە هۆکـاری دڵـەڕاوکێ و غـەم و پەژارەی هەمان ئافرەت، تاوەکو بڕوانامە وەردەگرێت و، ماڵئاوایی لە کۆلیژ دەکات و، دەبێتە پیاوێك، بـەڵام لەدواییـدا قـاچ لەسـەر قـاچ دادەنێت و، بەوپەڕی دڵنیاییەوە لەبەردەم مایکی میدیاکانـدا دەڵێـت: ئافرەت بێ عەقڵە!!

# 11

# وێستگەی یانزەیەم

## ئاوێنە بە ئامۆژگارییەکانی خەڵاتت دەکات و، ڕێزت لێ دەگرێت..



بزانە هاوڕێ و مرۆڤی ڕاستگۆش کاتێک ئامۆژگاریت دەکات و خاڵە ئەرێی و نەرێیەکانت بۆ دەخاتەڕوو، ئەوە ڕێزی لێناویت و، خەڵاتی کردوویت، چونکە ئەگەر وا نەکات ئەوە خیانەتی لێکردوویت و، بەشێوەیەک چەواشەی کردوویت کە

هەڵەکانی خۆت نەبینیت و، وا بزانیت لەسەر هەقیت، تا کاتێك بە خۆت دەزانیت کار لە کار ترازاوە و، دەرفەتی پێدا چوونەوە و چاکسازیت نەماوە.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین زۆر لە هاوڕێیان گوێیان لە ئاستی ئامۆژگارییدا کەڕە و، ئەو کەسانەشیان خۆشناوێت کە ئامۆژگارییان دەکەن، بە ئامۆژگاریی تووڕە دەبن و، پێی تێك دەچن، هەر وەك پێشینانیش فەرموویانە: **(قالۆنچە بۆنی گوڵ بکا سەری دێشێ)**.

بۆیە نابێت بە ئامۆژگاریی زویر ببیت و، دڵت تەنگ ببێت و، خۆت تووڕە بکەیت، بەڵکو دەبێت بەپێچەوانەوە، هەمیشە مەمنوونی ئەو کەسانە بیت ئامۆژگاریت دەکەن و، بە بەردەوام هەڵەکانت پیشان دەدەن و، ڕێنماییت دەکەن.

ئەگەر بتوانیت –لەگەڵ دەربڕینی ڕێز و سوپاس و پێزانینت– بە دیارییەك وەك هێمایەکی خۆشەویستیی خەڵاتی بکە.

ئەوەشت لە یاد بێت کە لە نزاو پاڕانەوە و دۆعای خێر بێ بەشی نەکەیت.

(عبدالله)ی کوڕی پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە باوکی دەڵێت: ئەم شافیعیە کێیە ئەوەندە زۆر دوعای بۆ دەکەیت؟!

ئەویش دەفەرموێت: ئەزانیت شافیعی کێیە؟! شافیعی بۆ دونیا وەك هەتاوە و، بۆ مرۆڤ وەك تەندروستیی و عافیەتە، ئایا هیچ شتێك هەیە جێی ئەم دووانە (هەتاو و عافیەت) بگرێتەوە؟!!

(عبدالرحمن کوڕی مهدی) قوتابی پێشەوا شافیعی کاتێك باسی ئیمامی شافیعی دەکات (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) دەفەرموێت: نوێژێکم نەکردووە دوعای خێری تیادا بۆ نەکەم.

خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: کەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کردن، پاداشتی بدەنەوە و، خەڵاتی بکەن، ئەگەر نەتانتوانی پاداشتی بدەنەوە، دۆعای خێری بۆ بکەن تا ئەو کاتەی دڵنیا دەبن پاداشتتان داوەتەوە.[1]

گوێ لە پێشەوای بڕوادارانیش (عومەری کوڕی خەتتاب –ڕەزای خوای لێ بێت–) بگرە، چۆن ڕەخنە بە دیاریی و خەڵات دەزانێت و،

---

١– سنن أبي داود – كتاب الزكاة– باب عطية من سأل بالله: عن عبد الله بن عمر، قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " من استعاذ بالله فأعيذوه، ومن سأل بالله فأعطوه، ومن دعاكم فأجيبوه، ومن صنع إليكم معروفا فكافئوه، فإن لم تجدوا ما تكافئونه، فادعوا له حتى تروا أنكم قد كافأتموه " صحيح ابن حبان – كتاب الزكاة– باب المسألة بعد أن أغناه الله جل وعلا عنها – ذكر الأمر بالمكافأة لمن صنع إليه معروف. السنن الصغرى – كتاب الزكاة– من سأل بالله عز وجل–

دوعای خێر بۆ ئەو کەسە دەکات ئامۆژگاریی دەکات و، هەڵەکانی بە دیاریی بۆ دەنێرێت و، دەفەرموێت: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی هەڵەکانم بە دیاری بۆ دەنێرێت.[1]

## دوو حیکایەت:

### حیکایەتی یەکەم: حیکایەتی جەنگیزخان و هەڵۆکەی

جەنگیزخان هەڵۆیەکی هەبوو، هەمیشە لە گەشتوگوزاردا بەسەر شان و باڵیەوە دەنیشتەوە، وەك هاوڕێیەکی دڵسۆز جەنگیزخانی بەجێ نەدەهێشت.



ئەم هەڵۆیە نموونەیەکی جوانی هاوڕێیەکی ڕاستگۆ و دڵسۆز و بە ئەمەك بوو.

ڕۆژێکیان لە گەشتێکدا بەیەکەوە بۆ ڕاوکردن خۆیان لە کاروان دواخست و، دوورکەوتنەوە.

---

١- سنن الدارمي - رسالة عباد بن عباد الخواص الشامي: قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه رحم الله من أهدى إلي عيوبي.

دوای ماندوبوونێکی زۆر، ڕێیان دەکەوێتە گۆمێک ئاو لەژێر تاشەبەردێکی گەورەدا.

جەنگیزخان جامەکەی پڕ ئاو دەکات و، بەرەو دەمی بەرزی دەکاتەوە، بەڵام دەبینێت هەڵۆ دڵسۆزەکەی باڵێك لە جامەکە دەدات و، ئاوەکە دەڕژێنێت.

جەنگیزخان جارێکی تر جامەکەی پڕ ئاو دەکاتەوە، بەڵام جەنابی هەڵۆ بە هەمان شێوە ئاوەکەی دەڕژێنێت.

جەنگیزخان –هەرچەندە تینوویەتی تەنگی پێ هەڵچنیوە و زۆری بۆ هێناوە– بەڵام خۆی دەگرێت و دان بە خۆیدا دەنێت.

بۆ سێیەم جار جامەکەی پڕ دەکاتەوە و، پێش ئەوەی لێوە وشکەکانی پێ تەڕ بکات، هەڵۆکەی بە هەمان شێوە لە دەستی وەردەگێڕێت و ئاوەکەی بۆ دەڕژێنێت!!

جەنگیزخان بەم کارە زۆر دڵی دەشکێت و تووڕە دەبێت، دەست دەداتە شمشێرەکەی دەستی و، لە ملی هەڵۆکەی دەدات و، دەیکوژێت.

دواتر جەنگیزخان، کە خوێن و لاشەی بێ گیانی هاوڕێ دڵسۆزەکەی بینی غەم و پەژارە دایگرتوو، هەناسەی ساردی بۆ

هەڵکێشا و، پەنجەی پەشیمانیی گەست، بەڵام کار لە کار ترازاوە و، هیچی پێ ناکرێت.

ئەوەی زیاتر جەنگیزخانی غەمبار و دڵگران کرد، ئەوەبوو کە بینی لەژێر تاشەبەردەکەدا مارێکی مردوو گۆمە ئاوەکەی ژەهراوی کردووە، ئەوکاتە زانی کە هەڵۆکەی چەند دڵسۆز و بەئەمەك بووە.

بۆیە کە گەڕایەوە کۆشك، پەیکەرێکی زێڕینی بۆ دروست کرد و، لە باڵی ڕاستی نووسی: **(هاوڕێی دڵسۆز با کارێکیش بکات بە دڵی تۆ نەبێت، هەر هاوڕێتە).**

لە باڵی چەپیشی نووسی: **(هەر کردارێك لە ئاکامی تووڕەییدا ئەنجامی بدەی، ئەنجامەکەی پەشیمانییە).**

پەیکەری هەڵۆی زێڕین تا ئێستاش ماوەتەوە و، لە یەکێك لە مۆزەخانەکانی مەنگۆلیا داستانی قوربانیدانمان بۆ دەگێڕێتەوە.

شاعیریش دەڵێت:

واذا الحبيبُ أتى بذنبٍ واحدٍ      جاءت محاسنه بألفِ شفيعِ

گەر خۆشەویستم بە تاوانێك بێتە لام

هەزار چاکەی دەبنە تکاکاری لێبوردنی.

## حیکایەتی دووەم: حیکایەتی قەڵەم و خەتکوژێن:

دەڵێن ڕۆژێك هەردوو جەنابی قەڵەم و خەتکوژێن لەسەر مێزی نووسەرێکی گەورەدا، ئەم گفتوگۆیەی خوارەوەیان کرد:

خەتکوژێن: چۆنی هاوڕێی ئازیزم؟

قەڵەم: من هاوڕێی تۆ نیم!!.



خەتکوژێن بەسەرسامیەکەوە: بۆ؟!

قەڵەم: چونکە من زۆر ڕقم لە جەنابتانە.

خەتکوژێن بە دڵێکی پڕ غەم و خەفەتەوە وتی: من چیم کردووە وا جەنابتان لێم زویرن؟!

قەڵەم: چونکە ئەوەی من دەینووسم تۆ دەیکوژێنیتەوە.

خەتکوژێن: بەڵام من تەنها هەڵەکانت دەکوژێنمەوە.

قەڵەم بە بێزارییەکەوە: تۆ کارت بە هەڵەی منەوە چیە؟!

خەتکوژێن: من خەتکوژێنم، تەنها کار و پیشەیەکم هەبێت کوژاندنەوەی هەڵەیە!!

قەڵەم: جا توخوا ئەمە کار و پیشەیە!.

خەتکوژێن سەیری چاوی قەڵەمی کرد و، پێی وت: ئەم کارەی من دەیکەم زۆر بەسوود و بەنرخە، بەتایبەت بۆ جەنابتان.

قەڵەم ئەوەندەی تر بێزار بوو و، بە شێوازێکی گاڵتەجاڕییەوە وتی: تۆ زۆر هەڵەی گیانەکەم!!

خەتکوژێن: بۆ وا دەڵێیت؟!

قەڵەم: چونکە ئەو کەسەی شتێك دەنووسێت لەو کەسەی دەیکوژێنێتەوە باشترە!.

خەتکوژێن: نەخێر، بەڵکو کوژاندنەوەی هەڵە یەکسانە بە نووسینی ڕاست.

لەلایەکی دیکەوە من دەبمە هۆکاری ئەوەی خەڵکی چاویان بە هەڵەکانت نەکەوێت، ئەگەر من نەبم خەڵکی بە هەڵەکانت دەزانن و، دەبیتە مەسخەرە و، بنێشتە خۆشەی سەر زاریان و، گاڵتە بە عەقڵت دەکەن.

قەڵەم لەدوای تێڕامان و، بیرکردنەوە لە وتەکانی خەتکوژێنی هاوڕێی، دانی بەوەدا نا کە خەتکوژێن ڕاست دەکات، بۆیە سوپاسێکی بێ پایانی خەتکوژێنی کرد و، وتی: ڕاست دەکەی

هاوڕێی ئازیزم، ئیدی من ڕقم لە کەسێك نابێت هەڵەکانم پیشان بدات و، بیانکوژێنێتەوە و، لە خەڵکیان بشارێتەوە.

خەتکوژێنیش وتی: منیش هیچ کاتێك ڕاستییەکانت ناشارمەوە و، نایانکوژێنمەوە.



قەڵەم: بەلام، دەتبینم ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بچووکتر دەبیتەوە!!

خەتکوژێن: بەڵێ، چونکە من هەموو جارێك بۆ کوژاندنەوەی هەڵەیەکی تۆ بەشێك لە لەشم دەکەمە قوربانیت.

قەڵەم: هاوڕێی ئازیزم، منیش هەست دەکەم ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کورتتر دەبمەوە و، بالای چناریی جارانم لە دەست دەدەم!.

خەتکوژێن: بۆ ناوی دەنێیت: لە دەستدان؟! تۆش ناوی بەختکردن و قوربانیدانی لێ بنێ، چونکە هیچ کەسێك بەبێ بەخت کردن و قوربانیدان، ناتوانێت سوود بە کەسێکی دیکە بگەیەنێت.

قەڵەم بە زەردەخەنەیەکەوە: بەڕاستی تۆ هاوڕێیەکی دڵسۆزیت، بە زانایی و دانایی خۆت زۆر شتت فێر کردم، پێخۆشحاڵم بە هاوڕێیەتیت.

خەتکوژێن: من خۆشحاڵترم، پەیمان بێت هەمیشە لە خزمەتتدابم.

**تێبینی:**

| |
|---|
| جێی داخ و ئەفسووس و تێڕامان و سەرسوڕمانە کە زۆر کەس دەبینین لەبەرئەوەی باوەڕیان بە ڕەخنە و پێداچوونەوە و کوژاندنەوە نییە، خۆیان بە خاوەن ڕاستیی ڕەها دەزانن کە ئەگەری هەڵەیان نییە، بۆچوونەکانیان بە وشکەنووس (قلم جاف) دەنووسن، بۆ ئەوەی کەس نەتوانێت وشەکانیان بکوژێننەوە. |

12

# وێستگەی دوانزەیەم

## ئاوێنە مەشێوێنە، چونکە خۆت دەشێوێنیت

ئاگاداربە: کاتێك ئاوێنەکەت دەشێوێنیت و، دواجار دەتەوێت سەیری خۆت بکەی، دەبینیت وێنەکەت شێواوە و، بە شێواویی خۆت دەبینیتەوە.

ڕوونیی و پاکیی وێنەکەت پەیوەستە بە ڕوونیی و پاکیی ئاوێنەکەتەوە، کاتێك ئاوێنەکەت دەشێوێنیت بزانە لەگەڵ شێواندنی ئاوێنەکەت وێنەی خۆیشت دەشێوێنیت و، کاتێك ئاوێنەکەت پاك دەکەیتەوە بە هەمان شێوە وێنەکەت وەك خۆی بەبێ شێواندن دەردەکەوێت.

کاتێك ڕووی ئاوێنـەت دەشـێوێنیت و، لـەلات ناشـیرین دەبێـت، بزانــە تــۆش لای ئــەو ناشـیرین دەبیــت و، دەشـێوێنرێیت، ئەگــەر بـاوەڕیش ناکـەیت، بـا بـۆ سـاتێکیش بێـت بـڕۆرە بـەردەم ئاوێنــە شـــــێوێنراوەکەت و، سەیری خۆت بکە! تا بزانیـــت لـــە هــــەر جێگایەکدا ئاوێنەکەت شــێواندبێت وێنـــەی خۆیشـــت لەگەڵیـــدا شێوێنراوە.



تـــۆش ئـــەی هـــاوڕێی ئــازیز و خۆشەویست، ئاگاداربە وێنەی هاوڕێکانت مەشێوێنە، باسی خراپەیان مەکە، پشتیان بەر مـەدە، بـە بـەردەوام هـەوڵ بـدە نەبیتـە هۆکـاری شێواندن و ناشیرین کردنی هاوڕێکانت، چونکە ئەوان بە تۆوە جوانن، تۆش بەوانەوە جوانیت، ناشیرین کردنیان ناشیرین کردنی خۆتە!

باوەڕیش ناکـەم کەسێکی عـاقڵ و هۆشمەنـد هـەبێت بەدەسـتی خۆی وێنەی خۆی ناشیرین بکات و، بیانشێوێنێت؟!!

# 13
## وێستگەی سیازدەیەم

**ئاوێنە بەتەنها جوانیت یا ناشیرینیت دەرناخات، بەڵکو جوانیی و ناشیرینیت دەردەخات و، بە جوان دەڵێت جوان و، بە ناشیرین دەڵێت: ناشیرین ◆●◆●•**

هاوڕێی دڵسۆزیش بەهەمان شێوە جوانیی و ناشیرینیت بۆ دەردەخات و، ڕاستیی و هەڵەکانت پیشان دەدات، ئەوەی بیبینێ و بیزانێ لێتی ناشارێتەوە.

ئەوەتا مەسیح -سەلامی خوای لەسەر بێ- کاتێك لەگەڵ حەوارییەکاندا لاکی سەگێکی تۆپیو دەبینن، دەبینێت حەوارییەکان تەنها باسی بۆگەنیی ئەو سەگە دەکەن و، دەڵێن: چەند بۆگەناوییە، چەند قێزەونە ! !

بۆیە مەسیح -سەلامی خوای لەسەر بێ- پێیان دەفەرموێت: سەیری دانەکانی بکەن، چەند سپی و جوانن!!

بەڵێ، حەوارییەکان لەسەر هەق بوون و، ڕاستیان کرد کاتێك باسی بۆگەنی ئەو لاکە تۆپیوەیان کرد، بەڵام لەوەدا هەڵە بوون کە چاویان تەنها خاڵە بزێو و ناشیرینەکانی دەبینی، بۆیە مەسیح -سەلامی خوای لەسەر بێ- سەرنجیان بۆ ڕاستیەکی دیکە و، خاڵێکی جوان و شیرین ڕادەکێشێت، ئەویش جوانیی و سپیەتیی ددانەکانی ئەو لاکەیە!!!



لەڕاستیدا زۆر کەس وەك ئەو حەوارییانە بیردەکەنەوە و ڕەخنە دەگرن، چاویان بەرایی نایەت گشت ڕاستییەکان ببینن، وەك ئەوەی چاویلکەیەکی ڕەشیان لەچاودا بێت دونیا بە تاریکستان و، خەڵکی بە ڕەش دەبینن!!

یاخود بەپێچەوانەوە، کاتێك کەسێکیان خۆشبوێت تەنها ڕووی گەش و جوانی خاڵە ئەرێیەکان دەبینن و، چاویان لە ئاستی هەڵە و ڕەخنەو خاڵە نەرێیەکان کوێرە و، گوێیان کەڕ.

نەخۆشییەکی کوشندەی کۆمەڵگاکەمان موجامەلە و شەرمکردنە لە دەربڕینی ڕاستییەکانە وەك خۆیان.

هاوڕێی ڕاستگۆ و دڵسۆز دەبێ بە ڕاست بڵێ ڕاست و، بە هەڵە بڵێ هەڵە و، ڕووپامایی بۆ کەس نەکات.

تاوانی شاردنەوەی ڕاستیی و جوانییەکان یەکسانە بە تاوانی شاردنەوەی هەڵە و ناشیرینییەکان. بەڵێ، دەبێت ڕەخنەکان تەنها لای ئەو باس بکات و، لای خەڵکی نەیاندرکێنێت.

## پەندی پێشینان:

ئەگەر جێت نەکەن، لە هیچ شار و گوند
بە شل هەر بڵێ: شل و، بە توند: توند
لە سێدارەت دەن، هەق دامەپۆشە
بانگی موحەممەد، ئاشکرا خۆشە



# 14

# وێستگەی چواردەیەم

## ئاوێنە باسی خراپەی خەڵکت بۆ ناکات و، باوەڕیش بە خەڵکانێکیش ناکات باسی خراپەی خەڵکی بۆ بگێڕنەوە

ئاوێنـه باسـی خراپـەی کەسـت بـۆ ناکـات و، ئەگـەر کەسـێکیش وێنەی شێواوی تۆی پیشان دابێت و، باسی خراپەی تۆی بۆ کردبێت، بۆت ناگێڕێتەوە.

مرۆڤـی بـڕواداریش خـۆی لـەم دوو کـارە بزێـوە دوورەپـەرێز دەگرێت:

یەکەم: بە خراپە باسکردنی خەڵکی لای تۆ.

دووەم: گێڕانەوەی تانە و تەشەر و بە خراپە باسـکردنی خـەڵکی بۆ تۆ.

قەت دەرفەت بەخۆی نادا قسەی ئەم لاو لات بۆ بگێڕێتەوە و، ببێتە هۆکاری چاندنی درکی ڕق و کینە لەدڵدا، یا زویر بوون و شەڕ و ئاژاوەنانەوە لەنێوان تۆ و خەڵکی دیکەدا، چونکە بەڕاستیی -وەك وتراوە- ئەو کەسەی جنێوت پێدەدا ئەو کەسەیە قسەی خراپی خەڵکیت بۆ دەهێنێت، یاخود گوتراوە: "من نمّ لك نمَّ عليك" واتە: ئەو کەسەی قسەی خەڵکیت بۆ دەگێڕێتەوە، قسەی تۆش بۆ خەڵکی دەگێڕێتەوە.

مرۆڤی باوەڕدار دەبێت -ئاوێنە ئاسا- لە پاشملە باسی خراپەت نەکات، بەڵکو تەنها لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەت لەگەڵیدا، چاکە و خراپەی خۆتت پێ بڵێت.

**وانەیەك:**

کەسێکی دانا دەیویست لەگەڵ ژنەکەیدا جیابێتەوە، لێیان پرسی: ژنەکەت چ خراپەیەکی هەیە وا تەلاقی دەدەیت؟! لە وەڵامدا پێی وتن: کەسی دانا باسی ژنی خۆی بۆ خەڵکی ناکات، لەدوای تەلاقدان و شوکردنەوەی پرسیاریان لێکرد: چ خراپەیەکی کردبوو وا تەلاقتدا ؟! لە وەڵامدا پێی وتن: کەسی دانا باسی ژن و کچی خەڵکی ناکات!

**حیکمەتێك:**

کەسێکی دەم شڕ و فیتنەچی هاتە لای دانایەك و، پێی وت: گوێم لێ بوو فلانە کەس جنێوی پێت دەدا و، باسی خراپەتی دەکرد.

کەسی دانا پێی فەرموو: ئەو تیرێکی بۆ هاویشتم، بەلام بەرم نەکەوت، بەلام جەنابتان بۆچی ئەو تیرەتان هەلگرتوو و هاتن چەقاندتانە ناو دلم؟!!

**هاوڕێی ئازیز و خۆشەویست:** جوان گوێ بگرە، قسە و قسەلۆکی خراپی خەلکیی وەك بەردی گەورە وایە، یا لەسەر پشتی خۆتی دەنێیت و هەلیدەگریت، لە دەرئەنجامیشدا پشتت دەشکێنێت، یان دەیخەیتە ژێر پێت و بالای خۆتی پێ بەرزدەکەیتەوە، ئەوکاتە بەئاسانی دەستت دەگاتە ئەو جێگایەی پێی نەدەگەیشتی و، بەسەر دیوار و بەربەستە بەرزەکاندا سەردەکەویت.

نەخۆشیەکی کوشندەی دیکەی کۆمەلگاکەمان لە پاشملە باسکردنی خەلکیە بە خراپە و، دوورەپەرێزیی لە ڕووبەڕووبوونەوە، بۆیە دەبینین لەکاتێکدا ڕووبەڕووی یەکدی دەبنەوە جگە لە ستایش و پیاهەلدان هیچ لە یەکتر نابیستن، بەلام هەر ئەوەندە لە یەك ترازان ستایش دەبێتە جنێو و خراپە باسکردن، بەکورتی: تا لەبەر چاوانە لەبەر دلانە، کە دوورکەوتەوە لە ڕیزی پێشەوەی دوژمنانە!

**حیکمەتێك:**

**خەڵکی لە پاشملە بەو شێوەیە باس بکە کە حەز دەکەی لە پاشملە بەو شێوەیە باست بکەن.**

خۆشەویستیشﷺ دەفەرموێت: خراپترین کەس لەڕۆژی دواییدا دووڕووە، بە ڕوویەك دێتە لای ئەوان و، بە ڕوویەکی دیکە دەڕواتە لای ئەوانی تر.[1]

**هاوڕێی ئازیز:** تا لە تواناتدا هەیە خۆت دوورەپەرێز بگرە لەو کەسانەی بە هەڵەداوان هەوڵ دەدەن قسەی ئەم بۆ ئەو و، قسەی ئەو بۆ ئەم بێنن و، بۆ ئاژاوەگێڕان دار بە کونی زەردەواڵەدا دەکەن.

بەڵام نازانن: چاڵ هەڵکەن هەمیشە لە چاڵایە.

**چرپەیەك:**

گرنگ نییە کێ لە پاشملە باسی خراپەت دەکات، ئەوەندە بەسە بە بیستنی خشەی پێڵاوەکانت زمانی لاڵ دەبێت.

---

١- صحيح البخاري - كتاب الأحكام - باب ما يكره من ثناء السلطان عن أبي هريرة، أنه سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم، يقول: " إن شر الناس ذو الوجهين، الذي يأتي هؤلاء بوجه، وهؤلاء بوجه "

**پەندە شیعر:**

کــــێ لـــــە پاشملــــە، حـــــاکم ســــەربڕێ

نــــــاوێرێ لـــــــە ڕوو، قســــــەی دەربـــــــڕێ

مرۆڤی بڕوادار، نەك شەڕ و فیتنە نانێتەوە و، قسەی خراپ نابا و ناهێنێت، بەڵکو تا لەتوانایدا بێت ئاو بە ئاگری شەڕ و فیتنەدا دەکات و، هــەوڵی ئاشــتبوونەوە و چەســپاندنی ئاشــتەوایی و بڵاوبوونــەوەی ڕۆحی تەبایی دەدات.

**دانایی زانای گەورە (ابن الجوزی البغدادی):**

زانای گەورە و ناوداری جیهانی (ابن الجوزی البغدادی) خۆی کـرد بــە یــەکێك لــە مزگەوتــەکانی بەغـدادا و، بینــی موســوڵمانان قـڕە و مشتومڕیانە و، خەریکە دەست دەدەنـە یەخـەی یـەکتر و، بـە ناهــەق خوێن دەڕژن، کاتێك بینیان (ابـن الجـوزی) هاتـەژوورەوە هانایـان بـۆ برد و، وەك دادوەرێك پێی ڕازی بوون.

کێشمەکێش و دەمـەقڕەیان لەسـەر هـەردوو ئیمـامی ئەبوبـەکر و عــەلی بــوو –ڕەزای خوایــان لێ بــوو– ، کامیــان باشــترن؟ شــیعە دەیانگوت: عەلی، لای سوننەش ئەبوبەکر.

له (ابن الجوزی) هاتنه پێشه‌وه و، وتیان: پێمان بڵێ، ئه‌بوبه‌کر و عه‌لی، کامیان لای پێغه‌مبه‌رﷺ باشتره؟!

(ابن الجوزی) بیری کرده‌وه، هه‌ر کامێکیان هه‌ڵبژێرێ لایه‌نێکیان ڕازی نابن و خوێنی ناهه‌ق ده‌ڕژێت، بۆیه وتی:

ئه‌وه‌یان کچه‌که‌ی هاوسه‌ریه‌تی!!

شیعه‌کان وا تێگه‌شتن مه‌به‌ستی عه‌لییه‌، چونکه کیژی پێغه‌مبه‌رﷺ هاوسه‌ریه‌تی.

سوننه‌ش وا تێگه‌شتن مه‌به‌ستی ئه‌بوبه‌کره‌، چونکه کیژی ئه‌بوبه‌کر هاوسه‌ری پێغه‌مبه‌ره‌ﷺ.

به‌م شێوه‌یه‌ش ئاگری شه‌ڕ و فیتنه کوژایه‌وه‌.

15

# وێستگەی پانزەیەم

## ئاوێنە سینە ساف و بێگەردە، لە سینەی بێ کینەیدا جگە لە پاکیی و بێگەردیی جێگای هیچ جۆرە ڕق و، کینە و، ئیرەییەك نابێتەوە..

مرۆڤی باوەڕداریش دەبێت ئاوێنەئاسا سینە ساف و، دڵ پاك و بێگەرد بێت، بە هیچ شێوەیەك دەرفەتی ڕق و کینە و ئیرەیی نەدا هێلانەی خۆیان لە دڵیدا بنێنەوە.

خۆشیی بەهەشتیش لەوەدایە کە دڵەکان وەك بلووری بێگەرد ساف و پاك دەنوێنن و، بەزاری ڕق و کینە و ئیرەییان بۆ کراوە ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾الحجر: ٤٧.

دڵـی مـرۆڤ بـۆ مـەودای وەرگرتنـی ئامۆژگـاریی و کاریگـەریی ڕەخنەگرتن لەسەر بەرامبەر سەنگی مەحەکە، چونکە کاتێك کەسی بەرامبەر بزانێت دڵت تۆزقاڵێك گەردی گرتـووە، یـا سـینەت بـە کینـە ڕەش بـووە، یـا گومـانی لـە خۆشەویسـتیت لا دروسـت بـووە، یـا وا هەسـت بکـات مـەرامێکی دیکـەت لـەو ئامۆژگاریـەدا حەشـار داوە، ئامادەباشـیی بـۆ گـوێگرتن و، بـە هەنـد وەرگرتنـی ئامۆژگـاریی و ڕەخنەکانت نابێت.

بۆیە کاتێك دەتەوێت گوێت بۆ بگیرێت و، ڕەخنـەکانت بـە هەنـد وەربگیرێت و، ئامۆژگارییـەکانت کاریگـەری خۆیـان هـەبن، پێویسـتە دڵت خاوێن بکەیتەوە و، شەتڵی ئەوین لە دڵتدا بچێنیت.

بەڕاستی ئەم گەردوونە فراوانە -وەك شـاعیرێك دەڵێـت- بەشـی خۆشەویستیی و ئەوین ناکـات، ئیـدی نـازانم خـەڵکی چۆن لەدڵیانـدا جێگای ڕق و کینە دەکەنەوە؟!!

خۆشەویسـتیی و ئەوینـداریی گـەورەترین و گـرنگترین بنـەمای بونیادنـانی ئـەم گـێتی و گەردوونەیـە، گـەر ئـەوین و خۆشەویسـتیی نەبن، جیهان سەراپا خاپوور و وێران دەبێت.

ئاگاداربە: پشتیی، سەری دەوڵەمەند و هەژار، دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات، بچووك و گەورە، هەڵدەگرێت، بەڵام تەنها دڵ ساف و ویژدان ئاسوودە خەوی خۆشیان لێ دەکەوێت.

## حیکایەت:

تەڵحەی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کابرایەکی دەستکراوە و خێرخواز بوو.

هاوسەرەکەی پێی دەڵێت: کەسم لە براکانت تەماعبازتر نەبینیوە.

تەڵحە: چۆن؟

هاوسەرەکەی: چونکە دەیانبینم، لەکاتی دەوڵەمەندیتدا دێنە ماڵت، بەڵام لە کاتی نەبوونیتدا سەردانت ناکەن!

تەڵحە: بەڕاستی ئەوە لە ڕەوشتی بەرزیانەوەیە!.

چونکە لەکاتێکدا دێنە لامان توانای ڕێزلێگرتنمان هەبێ بۆیان، بەڵام لەکاتێکدا ناتوانین بەپێی پێویست میوانداریيان بکەین عەزیەتمان نادەن و، نابنە هۆی لە ڕوودامانیی و سەغڵەتیمان!.

ئیمامی ماوەردی لە هەڵوێستەیەکدا لەسەر ئەم هەڵوێستەی تەڵحە دەفەرموێت: جوان سەیر بکە و بزانە، چۆن پۆزشی بۆیان

هێنایەوە و، کردەوەی خراپیان بە چاکە هەژمار کرد و، بێ وەفاییان بە وەفاداری دانا، بەڕاستی ئەم کارە ئەوە دەگەیەنێت کە سینە سافیی لە دونیادا ئاسوودەییە و، لە دوارۆژدا دەستکەوت و هۆکاری چوونە بەهەشتە.



# 16

## وێستگەی شانزەیەم

### ئاوێنـە نە درۆت بە دەمەوە دەکات و، نە درۆت بۆ دەکات، بەڵکو ڕاستییەکان - تاڵ بن یان شیرین- وەك خۆیان دەردەخات.

ئێمـەش دەبێـت ئاوێنـە ئاسـا دادوەر بـین و، ڕاسـتییەکان وەك خۆیان بخەینەڕوو و، بە هیچ جۆرێك درۆ بە دەمی کەسەوە نەکەین و، درۆش بـۆ کـەس نەکـەین، چـونکە چـەمی درۆ سەرچـاوەی نزیکـە و، چرای بێ شەوقە و، پەتی باریکە و، زوو دەپچڕێت.

کاتێك کەسێك داوای ئامۆژگاری و هەڵسەنگاندنم لێدەکات، نابێـت ڕاستییەکانی لێ بشارمەوە و، بڵێم: تـۆ زۆر پـاك و بێگـەردیت، کـاراو لێهاتوو و شـارەزایت، گشـت بڕیارەکانـت ڕاسـت و حاشـا هەڵنـەگرن، لەکاتێکدا ئاگاداری هەڵە و چەوتیی بڕیار و پلانەکانی بم و، لە ناخمدا باوەڕم بەم هەڵسەنگاندنەی خۆم نەبێت.

یاخود پێی بڵێم: جەنابتان کەسێکی بێ ئەزموون و، نا شارەزان، بۆیـە گشـت بڕیـار و پلانـەکانتان هەڵـە و ناتـەواون، لەکاتێکـدا چـۆن گومـانم لـە بـوونی خـۆم و خـۆر نییـە ئاوەهـاش دەزانم کـە کەسـێکی لێهاتوو و، شارەزایە و، لە بڕیار و پلانەکانیدا سەرکەوتووە.

بەڵام بەداخەوە زۆر لـە هاوڕێیـان لەگـەڵ درۆدا بوونەتـە دۆسـتی گیـانی بـە گیـانی و، ئەگـەر بـۆ جـارێکیش بێـت ڕاسـتی بڵـێن ڕاستییەکەیان وەك گۆچان دەبینرێت و، ساغی وشەیان بە کۆڵی کـەر دەگەڕێ.

زۆر لە هەڵسەنگێنەرانی توێژینەوەی زانستیی بوارە جیاجیاکـانی ژیـان، تووشـی نەخۆشـی شـاردنەوەی ڕاسـتییەکان بـوون و، هەڵسـەنگاندنەکانیان لەسـەر هـیچ بنەمایـەکی زانسـتیی و یاسـایی ئـەنجام نـەدراون، بۆیـە ئـەنجامی هەڵسـەنگاندنەکانیان لـە ڕۆحـی دادپەروەری و ڕاستییەوە دوور دەبێت.

تـاوتوێکردنی نامـەی ماسـتەرنامە و، تێـزی دوکتـۆرا زەقتریـن نموونەی شاردنەوەی ڕاستییەکانن.

توێژینەوەی وا دەبینین کە تاوانـە نـاوی توێژینـەوەی لێ بنرێـت، بەڵام پلەی نایابی باڵا بەدەست دێنێت.

بە پێچەوانەشەوە توێژینەوەی تۆکمە و چاك دەبینرێت دوا دەخرێت، یاخود بە پلەیەکی نزم وەردەگیریت!!.

## دوو حیکایەت

### (پەتی درۆ کورتە، چرای زوو دەکوژێتەوە)

### حیکایەتی یەکەم:

فەرمانبەرێك لە ژوورەکەی خۆیدا دانیشتبوو، کەسێك لە دەرگایدا و، چووە ژوورەوە، جەنابی فەرمانبەر لەگەڵ چوونە ژوورەوەی میوانەکەی تەلەفۆنەکەی بە دەستەوە گرت و، خۆی سەرقاڵی تەلەفۆن کردن کرد و، بۆ ئەوەی پیشانی بدات کە فەرمانبەرێکی گەورەیە و، پەیوەندیی لەگەڵ جەنابی بەڕێوەبەر بەهێزە، وا خۆی پیشاندا لەگەڵ جەنابی بەڕێوەبەردا قسە دەکات.



کابرای میوان هەرچەندە دەیویست قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام فەرمانبەر سەری دەلەقاند و، ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد با چاوەڕوان بێت.

دوای ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانیی، جەنابی فەرمانبەر تەلەفۆنی داخست و، کەمێك خۆی تووڕە کرد و، بە دەنگێکی بەرز وتی: ئەی نازانیت، قسەم لەگەڵ بەڕێوەبەردا دەکرد و، بەیەکەوە تاوتوێی کارێکی زۆر گرنگمان دەکرد؟!

کابرای میوان بە داوای لێبووردنەوە وتی: ببورە قوربان، من فەرمانبەری چاککردنەوەی ئامێرەکانی تەلەفۆنم، هاتووم ئامێرەکەت چاك بکەمەوە، چونکە دوو ڕۆژە ئامێرەکەت لەکارکەوتووە.

جەنابی فەرمانبەر زمانی بوو بە تەڵەی تەقیوەوە و، نەیدەزانی لە وەڵامدا چی بڵێت؟! نە زەوی قووتی دەدا و، نە ئاسمان دەیڕفاند.

**هاوڕێی خۆشەویست:** خۆت بخەرە جێگای ئەو فەرمانبەرە درۆزنە -حاڵم بە حاڵی نەبێت- دەبێت چ هەڵوێستێکت هەبێت و، چۆن دەماری دەم و چاوت گرژ ببن و، عارەقی خەجاڵەتی بڕێژیت؟!

## حیکایەتی دووەم:

خاوەن کۆمپانیایەك گشت بەرپرسی بەشە جیاجیاکانی کۆمپانیاکەی کۆکردنەوە و، ئاگاداری کردنەوە کە بە هۆی بواری ناهەمواری تەندروستییەوە دەیەوێت بەڕێوەبەری گشتی بۆ کۆمپانیاکەی دابنێت، بۆ ئەم مەبەستەش هەریەکە و کیسێك تۆوی گوڵی تەسلیم کردن و، پێی گوتن: دەمەوێت هەریەکە و، تۆوەکەی

بچێنێت و، بە بەردەوام چاودێری بکات، لە دەرەنجامدا خاوەنی جوانترین و بۆنخۆشترین و گەشاوەترین گوڵ خەڵات دەکرێت و، دەکرێتە بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیا، بۆ ئەم مەبەستەش مۆڵەتێکی بۆ دیاری کردن.

دوای ماوەیەك لە وەرگرتنی تۆوەکان و چاندنیان، هەموو ڕۆژێك لە کۆمپانیادا باس باسی تۆوەکان بوو، هەریەکە و باسی خزمەتکردن و جوان چاودێری کردنی دەکرد، دوای ماوەیەك باسی ئەوەیان دەکرد چۆن تۆوەکان سەریان دەرهێناوە و، خەریکە خونچە دەکەن.



بەرە بەرە باس بوویە باسی جۆر و شێوە و ڕەنگ و بۆنی گوڵەکان و، هەر کەسێك شانازی بە گوڵەکەی خۆیەوە دەکرد، تەنها بەرپرسێك نەبێت، کە بە هیچ شێوەیەك نوتقی لێوە نەدەهات و، خۆی مت کردبوو و، هاوڕێکانی کردبوویانە بازاڕی مەسخەرە و گاڵتە پێکردن.

ئەم بەرپرسە لەماڵەوەش لەگەڵ خێزانەکەیدا هەمیشە لەسەر تۆوە گوڵەکە مشتومڕیان بوو، چونکە

تۆوەکەیان نە سەوز دەبوو و، نە گوڵی دەگرت، خێزانەکەی بەردەوام سەرزەنشتی دەکرد و، داوای لێ دەکرد بڕواتە بازاڕ و گوڵێکی جوان بکڕێت، با کەم گاڵتەی پێ بکەن و، بەڵکو گوڵەکەی ببێتە جێی سەرنجی خاوەن کۆمپانیاکە و، وەك بەڕێوەبەر هەڵیبژێرن، بەڵام هەرچەندی دەکرد و هەوڵی دەدا نەیدەتوانی ئەم کارە بکات و، گزیی لە هاوڕێ و خاوەن کۆمپانیا بکات.

مۆڵەتی دیاریکراو هاتە پێشەوە، هەر یەك لە هاوڕێکانی گوڵی خۆیان ئامادە کردبوو و، ناوی خۆیان لەسەر نووسیبوو، کۆمپانیا یەکپارچە وەك باغی ڕازاوەی گوڵی جۆراوجۆر خۆی دەنواند.

خاوەن کۆمپانیا دوای سڵاو و، وێڕای ڕێز و سوپاس و پێزانین، سەرسامی خۆی دەربڕی و، پێی گوتن کە بەڕاستی سەرسامە و، نازانێت چ گوڵێکیان هەڵبژێرێت!.

بەڵام ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشا ئەو بەرپرسە بێ گوڵە بوو، بۆیە بەسەرزەنشت و گلەییەکی زۆرەوە لێی چوویە پێشەوە و، پرسیاری هۆکاری نەهێنانی گوڵەکەی لێ کرد؟

کابرای بێ گوڵ بە ڕووزەردییەکەوە وتی: قوربان، هەرچەند هەوڵمدا تۆوەکە سەوز نەبوو!!

خاوەن کۆمپانیا: چۆن؟!

ئەویش لە وەڵامدا: نازانم!!

خاوەن کۆمپانیا دوای ئەم مشتومڕە، دەستی خستە ناو دەستی ئەم کەسە بێ گوڵە و، ڕووی کردە هاوڕێکانی و، پێی ڕاگەیاندن کە ئەوی بۆ بەڕێوەبەرایەتیی کۆمپانیا دەستنیشان کرد!!.

دوای بۆڵە بۆڵێکی زۆر و، دەربڕینی نارەزایی لەو دەستنیشان کردنەی کە بەپێچەوانەی ئەو بڕیارە بوو کە لەسەری ڕێکەوتبوون، خاوەن کۆمپانیا ئەم گرێ کوێرەی بۆ کردنەوە و، بە تووڕەییەکەوە پێی گوتن: ئێستا بۆم دەرکەوت هەمووتان درۆزن و فێڵبازن تەنها ئەم کەسە بێ گوڵە نەبێت، چونکە ئەو تۆوانەی کە لە منتان وەرگرت تۆوی گوڵ نین و، بەڵکو هیچیان کەڵکی چاندن و، توانای سەوز بوونیان نییە.



# 17

## وێستگەی حەڤدەیەم

### ئاوێنە لەو مەترسیانەی کە لە پشتەوەت دێن و تۆ لێیان بێ ئاگای، ئاگادارت دەکاتەوە..

مرۆڤ پشتی خۆی نابینێت، بەڵام لە ڕێگەی ئاوێنەوە دەزانێت لە دواوە چ باسە.

ئەوەتا دەبینین کاکی شۆفێر لە ڕێگەی ئاوێنەوە دەزانێت لە پشتەوە چ مەترسیەك هەیە و، خەریکە گیانی لەدەست دەدات.

هەر ئاوێنەشە پێت دەڵێ کەسێك لە دواوە وا خەریکە پەلامارت دەدات و، دەیەوێت بتکوژێت.

مرۆڤی ڕاستگۆ و مرۆڤ دۆستیش دەبێت وابێت، هەرکاتێك هەست بەوە بکات کە پیلانێك دژی هاوڕێیەکی هەیە بەزووترین کات – بەرلەوەی کار لە کار بترازێت– هاوڕێکەی ئاگادار دەکاتەوە.

گـەر هاوڕێیـەکت لـە بـوونی مارێـك یـا دووپشـکێك لـەژێر ئـەو دۆشـەکەی کـە لەسـەری ڕاکشـاوی ئاگـادارت بکاتـەوە، بـەو ئاگادارکردنەوەیە خۆشحاڵ دەبیت یان تووڕە و دڵگران؟

گەر ئەو ئاگادارکردنەوەیەت پێ ناخۆش بێت ئەوە نوێـژی مـردوو لەسەر عەقڵت بخوێنە و چوار (الله أكبر)ی جوانی بۆ بکە!.

ئەگەر خۆشـحاڵ دەبیـت و مـەمنوونیی خـۆت بـۆ ئـەو هاوڕێیـەت دەردەبڕیت کە لـە مەترسـیی و زیـانی ئـەو مـار و دووپشـکە ڕزگـاری کردیت، ئەوە بزانە زیانی عەیب و عـار و، هەڵـە و خواریـت، لـە مـار و دووپشك بەزیانتر و، سەختتر و، دژوارتر و، مەترسیدارترە.

بەڵام زۆرجار ئێمەی مرۆڤ دڵمـان تـەنها بـە پیاهەڵـدان و سـتایش کردن خۆش دەبێت و حەز ناکەین کەس پێمـان بڵێـت: سـەری چـاوت برۆیە؟!!

بەها و ئەرزش و قیمەتی ئاگادارکردنەوەمان لـە هەڵـە و عـەیب و عار نازانین.

یـاخود گـەر بـزانین مەترسـیەك یـان پیلانێـك دژی هاوڕێیـەکمان هەیە، وەك ئەوەی هیچ ئاگامان لێ نـەبێت خۆمـانی لێ گێـل دەکـەین، ئیدی چی بەسەر ئەو هاوڕێیەمان دێت لامان گرنگ نییە و، تـەنها بـیر

له بەرژەوەندیی خۆمان نەبێت بیر له هیچ شتێکی تر ناکەینەوە و، تەنها دەست بە کڵاوی خۆمانەوە دەگرین.

خۆشەویستیشﷺ دەفەرموێت: هیچ کەسێك لە ئێوە بڕوادار نابێت تاوەکو ئەوەی بۆ خۆی خۆشدەوێت بۆ براکەیشی خۆشبوێت.

تۆ چۆن حەز دەکەیت لە گشت مەترسی و پیلانێك ئاگادار بکرێیتەوە، بەهەمان شێوە دەبێت حەز بکەیت گشت هاوڕێیان و بڕواداران لەو پیلان و پلانانەی لە تاریکیی و ژێر پەردەدا دژی ئەوان دارێژرابێت ئاگادار بکرێنەوە.



# 18

## وێستگەی هەژدەیەم

# ئاوێنە، کاری بە ئێستەوە هەیە، نەك بە ڕابردوو و داهاتووی مرۆڤەکانەوە

تۆش -ئەی هاوڕێی دڵسۆز- واز لە ڕابردوو بێنە و، لەبری پەڕەی کۆن پەڕەیەکی نوێ هەڵبدەرەوە و، وەك جوو ئاسا قەرزی کۆن مەخوێنەرەوە، ئاوێنەئاسا تەنها ڕەخنە لە ئێستا بگرە و، کارت بە کۆنەوە نەبێت، ئەی نابینیت ئاوێنە وێنە ڕابردووەکان -با پێش چرکەیەکیش بن- دەسڕێتەوە و جارێکی دیکە بە چاوماندا ناداتەوە. بەڵام جەنابت دێیت و کای کۆن بە با دەدەیت، باسی پێش پەنجا ساڵ لەمەوبەر دەکەیت و، دووبارە و، سەدبارە بە چاوی بەرامبەردا دەدەیتەوە، لەکاتێکدا ئەم کارە نە لە دوور و، نە لە نزیك، لەکاری بڕوادار ناچێت و، دوورە لە پەیامی پیرۆزی قورئان و سوننەتەوە.

ئــەوەی ڕۆیــی ڕۆیــی، وازبێنــە و برینــی کــۆن جــارێکی دیکــە مەکولێنەوە. بـا –عفـا الله عما سلف– ویردی سـەر زمانمـان بێـت و، لـەبری ئـەوەی بـیر لـە هەڵە کۆنەکان و تاوانە ڕابردووەکـــــــــان بکەینـــەوە، قەڵـــەمی عـــەفو و لێبووردنیـــان بەسەردا بێنین و، لە خانەی مێشکماندا خانەبەدەریان بکەین.



با هەمیشە بیر لە جوانیی و هەڵوێستە مەردانەکان بکەینەوە.

خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: تەوبەکار لە گوناه وەك ئـەو کەسـە وایە کە بێ گوناهە.[1]

---

١– عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه قال: قال رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم: " التائب من الذنب، كمن لا ذنب لـه " رواه ابـن ماجـه في سننه، كتـاب الزهـد، بـاب ذكـر التوبة، والبيهقي في السنن الكبرى، كتاب الشـهادات، بـاب شـهادة القـاذف، والطبرانـي في المعجم الكبير، مَن اسمه عبد الله، طرق حديث عبد الله بن مسعود ليلة الجن مع رسول الله صلى الله عليه وسلم.

ئەمەش ئـەوە ناگەیـەنێت مرۆڤـی بـڕوادار گێـل بێـت و، هەمیشـە لەهەمان کونە ماری جارانـەوە مارەنگەسـتە بێـت، بـەڵکو دەبێـت زۆر ئاگادار بێت لەو کەسەی تاوان و غەدری لێ بینیوە جارێکی دیکە وەك مـار پێـوەی نـەدات، لەگـەڵ ئەوەشـدا نـابێ بەناوچـاویدا بداتـەوە و سەرزەنشت و لۆمەی بکـات، چـونکە سەرزەنشـتی بـەردەوام دەبێتـە هۆی بەردەوام بوون لە گوناه و تاواندا و، ڕێگری لە گەڕانەوە و تەوبە کردنی دەکات.

بۆیە لە دیدی قورئانی پیرۆز و سـوننەتی شـەریفەدا دەبینـین بـە کارێکی چاك گوناهی دەیەها ساڵ دەشۆرێتەوە و، چاکەیەك تەنگ بە سەدەها و هەزارەها خراپە هەڵدەچنێت.

فریشتەکانیش لەبەر خاتری ئـەو چـاکەیە گوناهـەکان دەسـڕنەوە و، لەبری هەر گوناهێك چاکەیەك دەنووسن!!

بـۆ پشـت ڕاسـتکردنەوەی ئـەم چـەمکەش بـا بەیەکـەوە بڕۆینـە خزمـەتی سـورەتی فورقـان، ئایـەتی(٧٠) و بـزانین خـوای گـەورە و میهرەبـــان چـــی دەفـــەرموێت: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾.

واته ئەگەر ئەو کەسە تاوانبارە تەوبە بکات و، باوەڕ بهێنێت و، کاری چاکە بکات، خوای گەورە کار و کردەوە خراپەکانی بە چاکە بۆ دەگۆڕێت.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُواْ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴾البروج: ١٠ ، بەڕاستی ئەوانەی سزا و ئازار و ئەشکەنجە و بەلا بەسەر پیاوان و ژنانی بڕواداراندا دێنن و، لە پاشان تەوبە ناکەن و پەشیمان نابنەوە سزای دۆزەخ و سزای سوتێنەریان بۆ هەیە.

ئەم دەقە پیرۆزەش باسی بەسەرهاتی ئەو زاڵمە بێ بڕوایانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە چاڵی ئاگریان بۆ بڕواداران ئامادە کردبوو و، بڕوادارانیان بە زیندوویی فڕێ دەدایە ناویەوە و دەیانسووتاندن، لەگەڵ ئەوەشدا دەفەرمووێ ئەوانە و هەر کەسێکی دیکەی هاوشێوەیان بەتایبەت لە بێ بڕوایانی مەککە ئەگەر تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە خوای گەورە بە سۆز و میهرەبانی خۆی لێیان دەبورێ.

ئیمامی بوخاری لە پێغەمبەری خواوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت کەسێك بەڕێگایەکدا دەڕۆیشت، دڕکێکی لەسەر ڕێگای خەڵکیدا لابرد و دووری خستەوە، (فشکر الله لە فغفر لە) خوای

پــەروەردگار سوپاســی کــرد و، لــە هــەموو گوناهــەکانی پێشــتری خۆشبوو.[1]

لــە فەرموودەیــەکی تــردا پێغەمبــەی نازدارمــان ﷺ بۆمــان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: کەسێك سەگێکی بینی لە تینی تینوویەتیدا خۆڵی دەخوارد، ئەو کەسە بە خوففەکانی پێی ئـاوی بـۆ هـەڵگرت و، تێـر ئـاوی کـرد و، تینوویـەتی شـکاند، ئـالێرەدا بـا بـزانین خـوای پەروەردگار لە پاداشتی ئەو کارە چاکەیدا چی کرد؟! (فشکر الله لـه، فأدخله الجنة) خوای پەروەردگار سوپاسی کـرد و خستیە بەهەشـتی بەرینەوە.[2]

یاخود خۆشەویستمان لـە فەرموودەیـەکی دیکـەدا –هـەروەك لـە سـەحیحی بوخاریـدا هـاتووە– دەفـەرموێت: سـەگێك لەبـەر تینـی تینوویەتی بەدەور بیرێکدا دەسوڕایەوە، ئافرەتێکی لەشفرۆشی بـەنی

---

١– صحيح البخاري، كتاب الأذان، أبواب صلاة الجماعة والإمامة، باب فضـل الـتهجير إلى الظهر. عن أبي هريرة رضي الله عنه: أن رسول الله صـلى الله عليـه وسـلم قـال: " بينمـا رجل يمشي بطريق وجد غصن شوك على الطريق فأخره، فشكر الله له فغفر له " ).

٢– صحيح البخاري، كتاب الوضوء، باب الماء الذي يغسـل بـه شـعر الإنسـان، عـن أبـي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم: "أن رجلا رأى كلبا يأكل الثرى مـن العطش، فأخذ الرجل خفه، فجعل يغرف له به حتى أرواه، فشكر الله له، فأدخله الجنة).

ئیسرائیلی بینیویەتی و، بەپێڵاوەکانی (خوففەکانی) ئاوی سەگەکەی دا، خوای گەورەش لە گوناهەکانی خۆشبوو.[1]

چەند خۆشە خوای پەروەردگار لەڕۆژی دواییدا لەبەرچاو هەموو بوونەوەردا پێت بفەرموێت: ئەی فلانی کوڕی فلان، وەرە پێشەوە، من بە گەورەیی خۆم لەبەرئەوەی دڕکێکت لە ڕێگای خەڵکیدا لابردووە، یان لەبەرئەوەی سەگێکت تێرئاو کردووە سوپاست دەکەم.

## لەتە خورما:

خاتوو عائیشە دایکی بڕواداران -ڕەزای خوای لێ بێت- دەیگێڕێتەوە و، دەفەرموێت:



ئافرەتێک دوو کچی لە باوەش گرتبوو و، هاتە ماڵی پێغەمبەرﷺ منیش

---

١- صحيح البخاري، كتاب أحاديث الأنبياء، باب حديث الغار، عن أبي هريرة رضي الله عنه، قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: "بينما كلب يطيف بركية، كاد يقتله العطش، إذ رأته بغي من بغايا بني إسرائيل، فنزعت موقها فسقته فغفر لها به".

ئەوەی شکم دەبرد سێ دەنکە خورما بوو پێم بەخشین، ئافرەتی دایك هەریەکە و دەنکە خورمایەکی دایە دەستیان و، دەنکە خورمایەکیشی بۆ خۆی دانا، بەڵام دوو کچەکە ئەوەندە برسیان بوو بەخێرایی دوو دەنکە خورماکەی خۆیان تەواو کرد و، کاتێك دایکیان دەنکە خورماکەی خۆی بۆ دەمی بەرز کردەوە و ویستی بیخوا، دوو کچە داوای ئەو دەنکە خورمایەیشیان کرد، دایکی میهرەبانیش دەنکە خورماکەی کردە دوو لەتەوە و، هەریەك لەتێکی پێ بەخشین، ئەم هەڵوێستەم زۆر بەلاوە سەیر بوو، بۆیە دوایی بۆ پێغەمبەرم گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: خوای گەورە لەبەر خاتری ئەو دەنکە خورمایە بەهەشتی بۆ مسۆگەر کرد، یاخود فەرمووی: لە دۆزەخ ڕزگاری کرد![1].

---

١- صحيح مسلم - كتاب البر والصلة والآداب، باب فضل الإحسان إلى البنات، عن عائشة، أنها قالت: جاءتني مسكينة تحمل ابنتين لها، فأطعمتها ثلاث تمرات، فأعطت كل واحدة منهما تمرة، ورفعت إلى فيها تمرة لتأكلها، فاستطعمتها ابنتاها، فشقت التمرة، التي كانت تريد أن تأكلها بينهما، فأعجبني شأنها، فذكرت الذي صنعت لرسول الله صلى الله عليه وسلم، فقال: "إن الله قد أوجب لها بها الجنة، أو أعتقها بها من النار".

# 19

# وێستگەی نۆزدەیەم

## ئاوێنە گومانی خراپ بە کەس نابات

ئاوێنە نازانێت گومانی خراپ چییە و، لە فەرهەنگیدا زاراوەیەك نییە ناوی گومانی خراپ بێت.

بەڵام بە داخەوە یەکێك لە نەخۆشیە کوشندەکانی کۆمەڵگا نەخۆشی گومان خراپییە.

گەر کەمێك لە کۆمەڵگا ورد بینەوە دەبینین گومانی خراپ چ کێشە و گرفت و نەهامەتی و دەردەسەرییەکی ناوەتەوە!

ئەوە گومانی خراپە بووەتە وێران کردن و، ڕماندنی سەدەها هێلانەی خێزان و، ژوانی لێکردوونەتە ژان و سەرئێشە و، ژیانی لێ تاڵ کردوون!!

ئەوە گومـانی خراپـە بووەتـە هـۆی تێکـدان و هەڵوەشـاندنەوەی چەندەها گرێبەست و پەیمانی هاوڕێیەتی ! !

ئەوە گومـانی خراپـە نێـوانی خـەڵکی شـێواندووە و، خـوێنی زۆر بێتاوانی ڕشتووە ! !.

دەبێت لەبەر ئەم هەموو خاڵـە خراپانـە بێـت خۆشەویسـتمانﷺ زۆر بـە تونـدی مرۆڤـی بـاوەڕداری لێ ئاگـادار کردووەتـەوە و، نـاوی "درۆترین قسە"ی لێناوە ! [1]

مەرج نییە هەموو گومانێك ڕاست بێت.

مرۆڤ زۆرجار گومانی خراپ دەبـات و، بـەرگی ڕاسـتیان بـە بـەردا دەکات، بەڵام لەدوای ئەوەی گومانی خراپ کاری خۆی دەکات و، کار لە کار دەترازێت، بۆی دەردەکەوێت گومانەکەی لەجێی خۆیدا نەبووە و، بە هەڵەدا چووە، ئەوکات جگە لـە هەناسـەی پەشـیمانی و پەنجـە گەستنەوە کارێکی دیکەی بۆ نامێنێتەوە.

---

١- صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب يا أيها الذين آمنوا اجتنبوا كثيرا من الظن، قال أبو هريرة رضي الله عنه: يأثر عن النبي صلى الله عليه وسلم، قال: " إياكم والظن، فإن الظن أكذب الحديث، ولا تجسسوا، ولا تحسسوا، ولا تباغضوا، وكونوا إخوانا، ولا يخطب الرجل على خطبة أخيه حتى ينكح أو يترك ".

(علی زین العابدین) کوڕی ئیمامی حوسەین –ڕەزای خوایان لێ بێت– تەنها نێرێکە لەو کەسانەی لەگەڵ ئیمامی حوسەیندا لە کارەساتی دڵتەزێنی کەربەلا لەبەر ئەوەی منداڵ بووە لە کوشتن ڕزگاری بوو.

ئەم عارفە گەورەیە لە دونیادا تاڵی زۆری چەشتووە و، کاتێك لە ناو خەڵکیدا دەردەکەوت دەیاندایە بەر تانە و تەشەر و، پێیان دەوت: چەند پیاوێکی دەست قوچاو و ڕەزیلە، هەرزن لە دەستی هیچی لێ هەڵناوەرێ، بەلام تەنها بە (سلاوتان لێ بێت) وەلامی دەدانەوە.

دوای چەند ساڵێك چەندەها ماڵ و خانەوادەی هەزار ناڵەو هاواریان لێ بەرزبوویەوە و، باسیان لەوە دەکرد کە کەسێکی نەناسراو بە نهێنی خێر و خێراتی بۆ دەهێنان و خۆی ئاشکرا نەدەکرد، بەلام ئەوە چەند ڕۆژێکە دەرگای خێری لێ داخستووین، لە دەرەنجامدا بۆیان دەرکەوت ئەو زاتە جەنابی ئیمامی (زین العابدین) بووە و دونیای فانیی بەجێ هێشتووە، ئەوکاتە بۆیان دەرکەوت کە ئیمام لە سلاوکردنەکەیدا مەبەستیی ئەو ئایەتە پیرۆزەی ژمارە ٦٣ی سوورەتی (الفرقان) بووە کە تیایدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا﴾، واتە: کاتێك نەفامان تانە و تەشەریان

لێ دەدەن و قسەی ناخۆشیان لەگەڵ دەکەن لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو.

## حیکایەت:

کابرایەکی ملیاردێر، بە جادەیەکدا زۆر بەپەلە بەرەو بانکێک دەڕوات، دەیەوێت پارەیەکی زۆر ڕابکێشێت، بەڵام ئەوەی بێزاری دەکات بابایەکی هەژارە کە بەخێرایی بەدوایەوە دێت و، هاوار دەکات: کاکە بوەستە، کاکە بوەستە!



ئەمیش بەتووڕەییەکەوە دەڵێت: ئەم سواڵکەرانە وازمان لێ نایەنن! ژیانیان لێ تاڵ کردووین، بۆیە هەنگاوەکانی خێراتر دەکات و، هەژار بەجێدێڵێت. بابای هەژاریش هەنگاوەکانی خێراتر دەکات و، بە هەناسەبڕکێ بەدوایدا ڕادەکات و، دووبارە و سێبارە هاوار دەکات: کاکە بوەستە کاکە

بوەستە !

کاکی دەوڵەمەنـد بەتووڕەییـەکی زیـاترەوە دەڵێـت: لـەوە زیـاتر بێزارم مەکە، بڵێ بزانم چیت لە من دەوێت؟

بابای هەژار دەڵێت: قوربان ببوورە، ئەوە جانتـای جەنابتانـە لـە ڕێگادا لێت کەوتە خوارەوە ! !

کاکی دەوڵەمەند لـەو کاتـەدا هەسـتی بـە خەجاڵـەتی کـرد و، بـە کزیەکەوە سەری ڕێز و سوپاسی دانەواند و، داوای لێبوردنی لە بابـای هەژار کرد، چونکە لەو جانتایەدا چـەکی بانـك و، پەسـاپۆرت و چـەند گرێبەستێکی گرنگی تێدا بوو.



# 20
# وێستگەی بیستەم

## ئاوێنە حوکمی پێش وەختی نییە

بۆ یەکەمجار کەسێك دەبینێت، هێشتا نەیناسیوە و، مامەڵەی لەگەڵ نەکردووە دەڵێت: خۆ دیارە کە پیاوی خراپە، بە ناوچاوانییەوە نووسراوە شەڕ فرۆشە، هەر کە سەیرم کرد زانیم خەیری بە ناوچاوانەوە نییە، یاخود زۆر لە فێڵباز و ساختەچی دەچێت!!

زانایانی لۆژیك دەڵێن: حوکمدان بەسەر هەر شتێکدا بە زانینی ئەو شتەوە بەندە و لەسەر ئەو بونیاد دەنرێت، واتە: ئەگەر شتێکت یا کەسێکت بەتەواوی نەناسی ناتوانی بیخەیتە لیستی ڕەش یا لیستی سپی و، بە خراپ یا بە چاکی بزانیت.



بەڵکو دەبێت بڕیاردان بە چاکی و خراپی هەر کەسێك لە ڕێگەی تێکەڵبوون و ناسینی نزیکەوە بێت.

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لەسەر بێت) گوێی لە کەسێك بوو شایەتی لەسەر چاکەی کەسێکی تری دەدا، بۆیە پرسیاری لێ کرد:

– سەفەرت لەگەڵ کردووە؟

– نەخێر.

– مامەڵە و کڕین و فرۆشتنت لەگەڵ کردووە؟

– نەخێر.

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لەسەر بێت) لۆمە و سەرزەنشتی دەکات و پێی دەفەرموێت: وابزانم بە چەند ڕکاتێك نوێژی خەڵەتاویت. دەبینین لێرەدا پێشەوای موسوڵمانان دوو پێوەری بۆ ناسینی خەڵکی داناوە:

یەکەمیان: سەفەرە، چونکە سەفەر هەقیقەتی خەڵکیت بۆ دەردەخات و، لە بنەڕەتی زمانی عەرەبیدا لە سێ پیت پێکهاتووە (سین، فاء، را) ئەم سێ پیتەش لە هەر وشەیەکدا هەبن مانای پەردە لەسەر لابردن و، دەرخستن و ئاشکرا کردن لەخۆدەگرتن، بۆ نموونە دەڵێیت: امرأة سافرة: واتە ئافرەتێکی پەردەی جلوبەرگی لەسەر لاشەی لابردووە و، خۆی دەرخستووە.

فسَّر القرآن: واتە: پەردەی لەسەر ماناکانی قورئانی لابرد و، دەریخستن.

سەفەریش پەردە لەسەر هەقیقەتی کەسەکان لادەبات و، هەقیقەتیان دەردەخات.

دووەم پێوەر پێوەری مامەڵە و کڕین و فرۆشتنە، کە خەڵکی لەسەر سەنگی مەحەك دادەنێت و، ڕاستی و درۆزنی، دەستپاکیی و دەستپیسیی، بە ویژدانی و بێ ویژدانی کەسەکان دەردەخات.

# 21
# وێستگەی بیست و یەکەم

## ئاوێنە تەنها کاری بە تۆوە هەیە و، هەقی بەسەر باوك و دایك و خوشك و برا و خێزان و کەسوکارتەوە نییە..

کاتێك لەبەر ئاوێنەدا ڕادەوەستیت، ئاوێنـە جوانیی و ناشـیرینی تەنها خۆتت پیشان دەدات، کاری بەسەر باوك و دایك و، خوشك و برا و، خێزان و کەسوکار و، خەڵکی دیکەوە نییە.

مرۆڤی بڕواداریش تـاوانی کەسـێك ناخاتـە سـەر کەسـێکی دیکـە. بەهۆی خراپەی کەسێکەوە کەسێکی تر تاوانبار ناکات، چونکە جاری وا هەیە کوڕێك خراپە، بەڵام بـاوك و دایـك و، کەسـوکاری کەسـانێکی باشـن، ئەگـەری ئـەوەش هەیـە لـە هـۆزێکی خراپـدا کەسـێکی بـاش هـەبێت، یـاخود بەپێچـەوانەوە لـە هـۆزێکی باشـدا کەسـێکی خـراپ

هەبێت، وەك ئەبو جەهلی خراپ لە قورەیشدا، یاخود کەسێکی باشی وەك (عبدالله بن سلام) لەناو جولەکەدا.

باوك و باپیرانیشمان فەرموویانە: کەس ناچێتە گۆڕی کەسەوە و، چەمیش بێ چەقەڵ نابێت!!

ئەی نابینیت خوای باڵادەست لە چوار جێگای پەرتووکە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[1]، هیچ کەسێك باری تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت.

لە ئایەتی ٣٨ی سورەتی (النجم) یشدا دەفەرموێت: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾.

ئەوەتا نوح (سەلامی خوای لەسەر بێت) پێغەمبەرە و، یەکێکە لە پێنج (أولو العزم)ـەکان، لەگەڵ ئەوەشدا خێزانەکەی و کوڕەکەی بێباوەڕ بوون، بۆیە خوای گەورە لەناوی بردن، نە چاکەی نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) درایە پاڵ ئەوان و، نە کردەوەی خراپی ئەوان خرایە سەر شانی ئەم!!.

١- الأنعام: ١٦٤، الإسراء:١٥، فاطر:١٨، الزمر:٧.

خێزانی لوط پێغەمبەریش (سەلامی خوای لەسەر بێت) بێ باوەڕ بوو و، خوای گەورە لە ناوی برد!! خوای گەورە لەگەڵ ئەوەشدا، نە لۆمەی نووح دەکات و، نە لۆمەی لوط، چونکە تاوان تاوانی ئەمان نییە، بەڵکو، کێ تاوانبارە ئەوە سزا دەدرێت.

خۆشەویستیش ﷺ لۆمە و سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات جنێو بە مردوو دەدەن و، دڵی زیندووانی پێ دەڕەنجێنن[1]، زیندوو چی بکات گەر باوکی، یان دایکی، یاخود هەر خزمێکی تری لە ژیانیاندا خراپ بووبن و، بە خراپی سەریان نابێتەوە و، بەبێ بڕوایی لە دونیای فانیی دەرچووبن، بۆیە پێمان دەفەرموێت: جنێو بە مردووان مەدەن دڵی زیندوانی پێ بڕەنجێنن.

ئەم فەرموودەیە لەکاتێکدا فەرمووی هەندێ نەوەی بێ باوەڕە لە دونیا دەرچووەکان موسوڵمان بووبوون، وەك عەکرمەی کوڕی ئەبو جەهل، بەڵام موسوڵمانان قسەیان بە ئەبو جەهل و، باوکە بێ باوەڕەکانی دیکە دەوت و، دڵی نەوەکانیان پێ دەڕەنجان.

زۆر بەداخەوە، تا ئێستاش لە کۆمەڵگای کوردەواری خۆماندا ئەم دیاردە بزێوە بە زەقی دەبینرێت!. دەبینین -کاتێك- ڕەخنە لە

---

١- (قال رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم: "لا تسبوا الأموات فتؤذوا به الأحياء" أخرجه الطبراني في المعجم الصغير، من حديث صخر بن وداعة الغامدي.

کەسێك دەگیرێت، جنێو بە باوك و دایك و، خزم و، کەسوکاری دەدرێت، لەکاتێکدا ئەوانە، نە لە دوور، نە لە نزیك، هیچ پەیوەندییەکیان بە خراپەی ئەو کەسەوە نییە.

## دانایی زانایەك:

میرێك فەرمان دەدات لەسەر مینبەرەکانی میرنشینەکەی نەفرەت لە ئیمامی حوسەینی کوڕی فاتیمەی زەهرا، شەهیدی کەربەلا (ڕەزای خوایان لێ بێت) بدەن، مامۆستای وتارخوێنیش هیچ ڕێگایەکی لە بەردەمدا نامێنێت، یان دەبێت جنێو بە ئیمامی حوسەین بدات، یان لە سێدارە دەدرێت، بەڵام بە دانایی خۆی ڕێگا چارەیەکی دۆزیەوە و، شێوازێکی ڕەوانبێژی بەکارهێنا کە نەفرەتەکە بەر ئیمامی حوسەین نەکەوێت، لە وتارەکەیدا وتی:

أیها المسلمون، إن الأمیر یأمرکم بلعن الحسین ألا فالعنوه فقال المصلون: الله یلعنه ! ! ! واتە: موسوڵمانینە، جەنابی میر فەرمانی داوە نەفرەت لە ئیمامی حوسەینی کوڕی عەلی بدەین، من نەفرەتی لێ دەکەم، ئێوەش نەفرەتی لێ بکەن، هەموویان دەستیان بە نەفرەت کردن کرد، بەڵام نەفرەتەکە بۆ میر دەگەڕایەوە نەك بۆ ئیمامی حوسەین!

# 22
## وێستگەی بیست و دووەم

# ئاوێنە ئارامە و، ئابڕووبەر نییە



کاتێك ویستت ڕەخنە لە کەسێك بگریت، هێمنیی خۆت بپارێزە و، تا بتوانیت ڕەخنەکانت بەشێوەیەکی نهێنیی ئاڕاستەی بەرامبەر بکە و، لە دواییدا دەنگی دەهۆڵی بۆ لێ مەدە و، ئابڕووی مەبە.

**وشەی جوان...** بۆ بەیەك گەیشتن و، لەیەك گەیشتن كورتترین ڕێگەیە.

**وشەی جوان...** كلیلی دەرگای دڵە داخراوەكانە.

**وشەی جوان...** درەختێكی بە پیت و بەرەكەتە، ڕەگ و ڕیشەی بە ناخی دڵدا چەقاندووە و، پەل و پۆی بەرەو باڵا دەڕوات.

تۆش وشەی جوان بچێنە و، بەروبوومی جوان ببینە و، بەتام بخۆ و، كاتێ هەستت بە ماندوویی كرد تەشریف بەرە خزمەتی و، لە ژێر سایە و سێبەری پشوو بدە و، سەر خەوێك بشكێنە.

گەر وشەی زبر و دڕكاویش بچێنی، دەست و پەنجەت برینـدار دەبن و، زركە تاڵ نەبێت هیچت دەست ناكەوێت و، بۆ پشوودانیشـت بستێك سێبەرت نابێت.

خۆشەویستیشمانﷺ باسی كەسێكمان بۆ دەكات، كە بەبێ بیركردنەوە قسەیەك دەكات یا وشەیەك بەكاردێنێت و، زۆر گرنگی پێ نادات، بەڵام حەفتا پاییز بەرەو ڕۆخی دۆزەخ دەیبات.

گەر بتوانی بە بێدەنگیی ئامۆژگاریی خۆت بكەیت و، پەیامت بگەیەنیت، بێدەنگ بەو، قسەی تێكەڵ مەكە.

گەر بێدەنگیی کاری خۆی نەکرد، ئەو کاتە لە ڕێگەی وشەی جوان و نەرم و نیان، بە ترش و خوێی دانایی (حیکمەت)ەوە ئامۆژگاریی و هەڵسەنگاندنی خۆت بکە و، پەیامت بگەیەنە.

خوای بالادەست لە ئایەتی ٨٣ سورەتی (البقرة) فەرمانمان پێدەکات کە وشەی جوان و چاك و شیاو بە خەڵکی بڵێین و بگەیەنین ﴿وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾.

لە ئایەتی ٢٤ سورەتی حەجدا باسی کردەوەی بەهەشتیانمان بۆ دەکات کە بۆ گوفتاری پەسەند و جوان و شیرین ڕێنمایی کراون و، دەفەرموێت: ﴿وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾.

هەریەك لە ئێمە گەر سەیری ژیانی خۆی بکات، دەزانێت چەند جار بێدەنگ بوون لە ناخماندا بووەتە هۆکاری کووشتنی زۆر لە مانا و بیر و هزر و بۆچوونی جوان!

بەلام کوژراوان و شەهیدانی دەستی چەپەڵی وشە زۆرتر و، داخیان سەختتر و گرانترە.

بەیەك وشەی نابەجێ، چەند دڵ برینـدار دەکەیت و، چەند ورە دادەبەزێنیت و، چەند چاو پڕ لە ئەسرین و چەند ماڵ وێران و چەند لانە خاپوور دەکەیت.

هیچ کاتێك وشەی جوان و شیرین نەبووەتە هۆی لەدەستدان و دۆڕاندنمان، بەڵام بەهۆی وشەی بریندارکەر و کوشندەوە زۆرمان لەدەستداوە و، بە بەردەوام لەدەست دەدەین.

زۆرجار دەبینین وشە لە گوللە بریندارکەرتر و، جەرگبڕتر و، بەهێزتر و، کوشندەترە.

هەر وەك چۆن ئەو گوللەیەی لە لوولەی تفەنگێکەوە دەردەچێت بریندارکەر و کوشندەیە، زۆرجار بەهەمان شێوە و سەختتریش ئەو وشەیەی لە دەممان دەردەچێت بریندارکەر و کوشندەیە.

دەبینین هەرچۆن بەو گوللەیەی کە لە نووکی دەمانچەیەکەوە دەردەچێت و دەبێتە هۆی کوشتن و گیان لەدەستدانی خەڵکی، بەهەمان شێوە ئەو وشەیەی لە زارمان دەردەچێت دەبێتە هۆی لەگۆڕنانی پەیوەندییەکان و، زیندەبەچاڵکردنی بەها جوانەکان.

هەرچەندە هەندێك بەهۆی ئەو قسە زبر و، وشە جەرگبڕانە دوای ئەوەی هاوڕێکانیان لەدەست دەدەن و، دەستیان لە بنی هەمانەوە دەردەچێت، پەشیمان دەبنەوە و، کاڵەك بە ئەژنۆ دەشکێنن و، هەست بە ئازاری ویژدان دەکەن!! بەڵام دوای چی؟!!

بەڵام هەندێکی دیکەیان چونکە لە بنەڕەتدا وەك تەیری گوڵ عاشق بە داری زەقنەمووتن و، ویژدانییان سێ بە سێ تەڵاق داوە،

–وەك نە بایان دیبێت و نە باران– هەست بە ئازار و ئەشكەنجە و زویر بوونی بەرامبەریان ناكەن و، دان بەوەدا نانێن كە قسەیان زبر و، زاریان پڕ ژار بووە.

**هاوڕێی ئازیز؛** بە گوتنی وشەی جوان هیچمان لە كیس ناچێت... بەڵام بە وشەیەكی زبر و برینداركەر زۆرمان لە كیس دەچێت و، هیچیشمان دەست ناكەوێت.

**پێشینانیش فەرموویانە:** (هەموو دەفرێك چی تێدایە، ئەوەی لێ دەڕژێت).

هەر قسەیەكیش لە زار هاتەدەر -چاك بێت یا خراپ– جارێكی تر ناتوانیت بیگێڕیتەوە ناو زار، باپیرانیشمان -هەزار ڕەحمەتیان لێ بێت– لە دێر زەمانەوە فەرموویانە: **(شیر كە دۆشرا ناچێتەوە گوان).**

مەرجی سەركەوتنی بانگەشەكردن و ئامۆژگاریی و هەڵسەنگاندن، هەڵبژاردنی شێوازی چاك و، وشە و ڕستەی نەرم و جوان و، ڕەچاوكردنی یاسا و بنەماكانی حیكمەت و داناییە: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾النحل: ١٢٥.

ئەی پێغەمبەر، تۆش ئەی بڕوادار، بانگەواز بۆ لای ڕێگا و ڕێبازی پەروەردگارت بە دانایی و ئامۆژگاریی جوان بكە، بەڵام بە جوانترین شێوە دیالۆكیان لەگەڵ بكە.

ئەم مەرجە لەکاتێکدایە کەسی بەرامبەر گوێبیستی وتەکانت بێت و، نکۆڵی لە ڕا و بیروبۆچوونت نەکات.

بەڵام کاتێك ڕای جیاواز دێتە مەیدان و، لەبری بانگەشە و ئامۆژگاریی، دیالۆك دەبێتە کاری پێویست و هەنووکەیی، ئەوکاتە لە دیالۆکماندا دروست نییە شێوازی چاك بگرینەبەر، چونکە لێرەدا گرتنەبەری ڕێگا و شێوازی چاك -لە دیدی قورئاندا- داواکراو و مەبەست نییە!!

بەڵکو لەبری ڕێگا و شێوازی چاك، دەبێت ڕێباز و شێوازی چاکتر و، لەبری چاکتر چاکترین شێواز بگرینە بەر. ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾النحل: ١٢٥، ئاشکرایە دیالۆکیش لەکاتی بوونی ڕا و بۆچوونی جیاوازدا زیاتر کارا دەبێت.

﴿وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ ٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾ الإسراء:٥٣.

ئەی پێغەمبەر، بە بەندەکانم بڵێ: با جوانترین گوفتار بڵێن.

﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ﴾ العنكبوت:٤٦.

گفتوگۆ و دیالۆك لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانییەکاندا (گاور و جولەکە) مەکەن، مەگەر بە جوانترین شێوە نەبێت، جگە لەوانەی کە زوڵمیان کردووە.

وشەی (أحسن) یش وەك ئاشکرایە وشـەیەکی سەرنجڕاکێشە و، هەمیشە هانت دەدات بە بەردەوام بیربکەیتەوە، تاوەکو بزانیت کام وشەیە چاکتر و جوانتر و شیاوترە.

﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴾فصلت:٣٤.

چاکە وەك یەك نییە، خراپەش وەك یەك نییە، بە جوانترین شێوە بەرەنگاری خراپە ببەوە.[١]

---

١- لە ڕاڤە کردنی ئەم دەقە پیرۆزەدا، زۆر لە ڕاڤەکارانی قورئان کەوتونەتە هەڵەوە، وا ڕاڤەیان کردووە کە چاکە و خراپە وەك یەك نین، بەڵام بە لای منەوە ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە، چونکە ئەگەر ئەمە مەبەست بوایە ئەو کاتە ڕستەکە وای لێدەهات (ولا تستوي الحسنةُ والسيئةُ) و پێویستی بە دووبارە کردنەوەی پیتی (لا) نەدەکرد، بەڵام کاتێك دوو بارەی کردوەتەوە و فەرموویەتی (ولا تستوي الحسنةُ ولا السيئةُ) ئەو کات ئەوە دەگەیەنێت کە چاکە وەك یەك نییە، بە هەمان شێوە خراپەیش وەك یەك نییە، واتە چاکە یەك جۆر و یەك پلە نییە، بەڵکو سەدەها و هەزارەها و زیاتریش جۆری هەیە و، هەر جۆرێکیش پلەیەکی بەرزتر، یان نزمتری هەیە، خراپەش

ئـــەم دەقانـــە بەگشـــتی و دەســـتەواژەی "أحســـن" بەتایبـــەت، ئەوەمان فێر دەکەن، هەرکاتێك ڕێبازی چاکتر هەبێت چاك قەدەغەیـە و، کاتێك چاکترین هەبێت چاکتر قەدەغەیە.

کەسـێك لـە نـەیارانی دەسـەڵاتی ئەمەوییـەکان لـە دانیشـتنێکدا ئامۆژگاری (عبدالملك بن مروان) دەکات، بەڵام بە شێوازێکی توووند و، زمانێکی زبر، (عبدالملك) لە وەڵامدا دەڵێت: نە تۆ لە موسا و هـاروون (سەلامی خوایـان لەسـەر بێـت) باشـتریت و، نـە منـیش لـە فیرعـەون خراپترم، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە فەرمان بە موسـا پێغەمبـەر و هـاروون پێغەمبـەری بـرای دەکـات لـەکاتی گفتوگۆکردنیـان لەگـەڵ فیرعەون بە نەرم و نیانی قسەی لەگەڵ بکـەن و، بـە وشـەی تونـد و، زمانی زبـر لەگەڵیـدا نـەدوێن، بـەڵکو قسـەی نـەرمیان ببێتـە هۆکـاری

---

یەك جۆر و یەك پلە نییە، بۆ نموونە خواردنیماڵی تاکێك وەك خواردنی ماڵی میللەتێك نییە، نەزەریش وەك زینا نییە.

جا، ئەگەر جۆرەکانی چاکە لە نـاو خۆیانـدا وەك یـەك و یەکسـان نـەبن و، جۆرەکـانی خراپەش لە ناو خۆیاندا وەك یەك و یەکسان نەبن، ئەو کاتە چاکە و خراپەش وەك یەك و یەکسان نابن.

بەخۆداچوونەوە و، بیرکردنەوە و، لەخوای گەورە بترسێت: ﴿ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴾طه:٤٣-٤٤.

خۆشەویستیش ﷺ دەفەرموێت: نەرم و نیانی لە هەر کارێکدا بێت جوان و ڕازاوەی دەکات، لە هەر کارێکیشدا لا ببرێت ناشیرین و قێزەونی دەکات.[١]

**شاعیریش دەڵێت:**

تَعَمَّدني بِنُصْحِكَ في انْفِرَادي ... وجنِّبني النصيحةَ في الجماعهْ

فَإنَّ النُّصْحَ بَيْنَ النَّاسِ نَوْعٌ ... من التوبيخ لا أرضى استماعه

وَإنْ خَالَفْتني وَعَصَيْتَ قَوْلِي ... فَلاَ تَجْزَعْ إذَا لَمْ تُعْطَ طَاعَه

بەکورتی و بە کوردی:

دوور لە خەڵك و، دوو بە دوو ئامۆژگاریم بکە، چونکە ئامۆژگاریی کردن لەناو خەڵکدا جۆرێکە لە لۆمە و سەرزەنشت کردن، منیش حەز بە بیستنی ناکەم، ئەگەر سەرپێچیت کردم و قسەت شکاندم، ئیتر گلەیی لەوە مەکە بەگوێت ناکرێت.

---

١- عن عائشة، زوج النبي صلى الله عليه وسلم، عن النبي صلى الله عليه وسلم، قال: "إن الرفق لا يكون في شيء إلا زانه، ولا ينزع من شيء إلا شانه" صحيح مسلم - كتاب البر والصلة والآداب- باب فضل الرفق.

زۆر گرنگە لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکیدا بگەڕێین بە دوای وشە ڕەنگین و جوانەکاندا کە گەشبینیی و ئومێد و کامەرانی دەبەخشنە دڵەکان و، تەنگ بە غەم و پەژارە هەڵدەچنن، زمانی کوردیش وەك زمانە دەوڵەمەندەکانی دیکەی جیهان پڕە لە وشەی جوان و ڕازاوە و ڕەنگین، هەرچەندە ئێمە وازمان لە وشە جوانەکان هێناوە و، پەنامان بۆ هەندێ وشەی دیکە بردووە کە توند و تاڵن و، دڵەکان بە ڕەشبینیی و نائومێدی پڕ دەکەن.

لە زمانی عەرەبیدا هەوڵدراوە لە بەکارهێنانی وشەدا واز لەو وشانە بێنن کە گەشبین و ئومێدبەخش نین، بۆیە لە بری (أعمى، أصم، لديغ، صحراء) کوێر، کەڕ، گەستراو، بیابان، دەڵێن: (بصير، سميع، سليم، مفازة) واتە: بینەر، بیسەر، ساغ، جێی ڕزگار بوون.

بەڵام ئێمەی کورد هەر دەڵێین کوێر و نابینا، کەڕ، گەستراو، بیابان. دەبوایە ئێمەش هەوڵمان بدایە لەبری ئەم وشانە، چەند وشەیەکی گەشبینمان بەکاربهێنایە. هەروەها دەبینین لە زمانی عەرەبیدا وشەی (ممرض) بەکارناهێنن، بەڵکو دەڵێن (مستشفى)، لەمەش جوانتر وشەی (مشفى)ـایە، کە هەندێ وڵاتی عەرەبی بەکاری دێنن، چونکە یەکەمیان بە واتای ئەو جێگایەی داوای شیفای لێ دەکرێ دێ، بەڵام دووەمیان بە مانای جێگای شیفایە.

بەڵام ئێمەی کورد هەر دەڵێین: خەستەخانە، یان نەخۆشخانە، کە مرۆڤ بە بیستنی ماندوو و خەستە دەبێت، بۆیە داوا دەکەم لەبری خەستەخانە و نەخۆشخانە وشەی "چارەخانە" بەکاربهێنین.

بەکارهێنانی وشەی ئومێدبەخش لە دەروونی خەڵکیدا زۆر کاریگەریی ئەرێیی دەبێت، بەپێچەوانەی وشەی رەشبین و تاریک بین کە کاریگەری نەرێیی خۆی هەیە.

رووداوێك:

کەسێکی ناسراومان کەمێك هەستی بە ناساغی و تێکچوونی باری تەندروستی کرد، بەمەبەست ئەنجامدانی پشکنینی تەندروستی رووی کردە نۆرینگەی پزیشکێك و چوار نهۆم بەپێی خۆی بەرەو نۆرینگە سەرکەوت، بەبێ ئەوەی هەست بە ماندوبوون بکات گەیشتە لای دکتۆر، دکتۆریش دوای ئەنجامدانی پشکنینی پێویست بۆی دەرکەوت کە تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە، بۆیە بەبێ پێچ و پەنا و، بەبێ ئەوەی بیر لە کاریگەریی نەرێی گەیاندنی ئەم هەواڵە ترسێنەرە لەسەر دڵ و دەروونی نەخۆش بکاتەوە بە نەخۆشەکەمانی راگەیاند کە تووشی نەخۆشییەکی ترسناك بووە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و تێڕامانە تەنها بە بیستنی ئەم هەواڵە دڵتەزێنە نەخۆشەکەمان لە پێ کەوت و هەردوو چۆکی وشك بوون و لە کار کەوتن و، کەوتنە زەوی

و، نـەیتوانی هەڵسـێتەوە و هـەنگاوێك بنێـت، بۆیـە بـە (پاسـكیلە كورسی) لە قادرمەكانەوە هێنایانە خوارەوە!!

بەڵێ، بەپێی خۆی سـەركەوت، بـەڵام بـە بیسـتنی وشـەیەك بـە عارەبانە هێنایانە خوارەوە!! بەڵام دوای بەدواداچوون و ئەنجامدانی چەند پشكنینێكی دیكە دەركەوت كە جەنابی دكتۆر بە هەڵەدا چووە و، نەخۆشـەكەمان نەخۆشـییەكی ئـەو تـۆی نـەبووە، بـەڵام، دوای چی؟! دوای لەدەستدانی هێزی ئەژنۆی؟!

## دوو چیرۆك:

### چیرۆكی یەكەم:



دەگێڕنـــەوە دەڵـــێن: پیاوێـــك خـەوێكی بینیبـوو، بـۆ لێكدانـەوەی خەونەكـەی چـووە لای كەسـێكی شارەزا، ئەویش پێی وتبوو: هـەموو كەسـوكارت دەمـرن و، كۆسـتت دەكـەوێت و، خـۆت بـە تـەنها دەمێنیتەوە، ئەم كابرایەش بە بیستنی ئەم لێكدانەوەیـە زۆر دڵتـەنگ و غـەمبار بـوو، لـە ڕێگـادا (إبـن سـیرین)ی زانـای گـەورە و ناسـراو و پسپۆڕی لێكدانەوەی خەونـەكانی بـینی و، خەوەكـەی بـۆ گێڕایـەوە،

ئەویش فەرمووی: مژدە بێت، خوای گەورە تەمەنت درێژ دەکات و، بە تەمەنترینی کەسوکارت دەبیت، کابرای دڵتەنگ و غەمباریش بە بیستنی ئەم لێکدانەوەیە غەم لە دڵیدا نامێنێت و، دڵخۆش دەبێت، لە کاتێکدا–جگە لە شێوازی دەربڕین– هیچ جیاوازییەك لەنێوان هەردوو لێکدانەوەکەدا نەبوو.



## چیرۆکی دووەم:

گاڵتە بە خەڵك بکەیت، گاڵتەت پێ دەکرێت:

کەسێکی دەشتەکی، لەسەر سفرە و خوانی ڕازاوەی یەکێك لە سوڵتانەکاندا زۆر بەخێرایی و بەپەلە پارووی گەورەی لە گۆشتی مەڕ دەنا، سوڵتانیش لەکاتێکدا بە نەرمی پارووی دەکرد، بە زمانێکی گاڵتە ئامێز ڕووی تێکرد و وتی: ئەوە بۆ بەزەییەکت پیانایەتەوە وەك ئەوەی دایکی قۆچی لێدابیت؟!

دەشتەکیش لە وەڵامدا پێی وت: ئەی جەنابت بۆ وا بەزەییت پێدا دێتەوە، وەك ئەوەی دایکی شیری پێدا بیت؟!

# 23
## وێستگەی بیست و سێیەم

# ئاوێنە مامەڵە لەگەڵ ڕواڵەت دەکات، کاری بە دەروون و ناوەوە و، وردەکاریی نادیارەوە نییە.

دەبینین ئاوێنە لە هەڵسەنگاندندا کاری بە دەروون و جیهانی شاراوە و نادیار نییە، بەڵکو تەنها مامەڵە لەگەڵ ڕواڵەت و جیهانی دەرەوە و دیار دەکات و، کەس بە دەروون پیس ناوزەد ناکات.

مرۆڤی داناش -بە هەمان شێوە- کاری بە دەروون و ناخی مرۆڤەکانی دیکەوە نییە، چونکە ناتوانێت بچێتە ناو دڵەکان و ئاگاداری ناو دەروونیان بێت.

مرۆڤەکان لە ڕۆژگاری دژواری ئەمڕۆماندا بە چاوی خراپ سەیری یەکتر دەکەن، هەر کارێکی چاکیش ببینن، دەیەها شرۆڤە و، لێکدانەوەی خراپی بۆ دەکەن!.

کاتێک کەسێک دەبینن سەرقاڵی کاری خێرە و، سەروەت و سامانی لە تێرکردنی هەژاران و، پۆشتەکردنی ڕەش و ڕووتان و، بەنازکردنی بێ نازان و، دەسگرۆیی بێ نەوایان و، دروستکردنی مزگەوت و فێرگە و چارەخانە و چەندەها کاری خێری دیکە خەرج دەکات، بە زمانی درێژ و زاری پڕ لە ژاریان دەیدەنە بەر هێرشی توانج و ڕەخنە، بە دەیەها تۆمەتی جیاجیا و سەیر و سەمەرە تۆمەتباری دەکەن و، ناوی دەزڕێنن.



یەکێکیان دەڵێت: خوا دەزانێت، ئەو سەروەت و سامانەی لە کوێوە بە دەست هێناوە و، چۆن پەیدای کردووە!

یەکێکی تر: ئەگەر بۆ خۆ فش کردنەوە و شوهرەت پەیدا کردن نەبێت بۆ ئەو کارانە دەکات! !.

بەم شێوەیە دەم لە کاری خوا وەردەدەن و، ناخ و دەروونی خەڵکی دەخوێندنەوە!

ئوسـامەی كـوڕی زەیـد –ڕەزای خـوای لیّ بێـت– دەیگێڕێتـەوە: جارێكیان لە جەنگێكدا پەلاماری كەسێكی دوژمنم دا بیكـوژم، كاتێـك شمشێرم لیّ بەرزكردەوە شایەتومانی هێنا و وتی: لا إله إلا الله، بـەڵام من كوشتم، دواتر هاتمە خزمەتی خۆشەویسـتﷺ و داسـتانی خـۆم و ئەو كەسەم بۆ گێڕایەوە، بەڵام خۆشەویسـتم بـینی زۆر تـووڕە بـوو و فـــەرمووی: وتـــی لا إلـــه إلا الله و كوشـــتت؟! ! منـــیش وتم: ئـــەی پەیامبەری خوا، لـە ترسـی شمشـێرەكەی دەسـتم وتـی لا إلـه إلا الله، خۆشەویستﷺ فەرمووی: ئەی بۆ دڵت لەت نەكرد تا بزانیت لە ترسا وتوویەتی یان نا؟ لە پاشان خۆشەویست ئەوەندە دووبارەی كـردەوە و سەرزەنشـتی كـردم تـا ئاواتـەخواز بـووم ئـەو ڕۆژە موسـوڵمان بوومایە!.[1]

---

١– عن أسامة بن زيد: قال: بعثنا رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم في سـرية، فصـبحنا الحرقات من جهينة، فأدركت رجلا فقال: لا إله إلا الله، فطعنته فوقع في نفسي مـن ذلـك، فذكرته للنبي صلى الله عليه وسلم، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " أقـال لا إلـه إلا الله وقتلته ؟ " قال: قلت: يا رسول الله، إنما قالهـا خوفـا مـن السـلاح، قـال: " أفـلا شققت عن قلبه حتى تعلم أقالها أم لا ؟ " فما زال يكررها علي حتى تمنيت أني أسلمت يومئذ، قال: فقال سعد: وأنا والله لا أقتل مسـلما حتـى يقتلـه ذو الـبطين يعـني أسـامة،

# 24

## وێستگەی بیست و چوارەم

# ئاوێنە بەرتیل و دیاری و پاداشت لەسەر کارەکەی وەرناگرێت..

ئاوێنە –وەك ئاشکرایە– بەرتیل ناخوا و، کاری بە دەسەڵات و دینار و دۆلارەوە نییە، بەڵکو بە دڵسۆزییەوە کاری خۆی ئەنجام دەدات، نە چاوی لە گیرفانی پڕە و، نەترسی لە هێز و بازووی جەندرمە و خوێنمژانە.

---

قال: قال رجل: ألم يقل الله: وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين كله لله ؟ فقال سعد: قد قاتلنا حتى لا تكون فتنة، وأنت وأصحابك تريدون أن تقاتلوا حتى تكون فتنة. صحيح مسلم – كتاب الإيمان– باب تحريم قتل الكافر بعد أن قال: لا إله إلا الله.



گــەر دراو و زێـــڕ و زیــوی قاروون و، موڵکی سولەیمان و، دەســـەڵاتی فیرعـــەون و، دڵـــی ڕەقی بـێ بـەزەیی (حـەجاج) و (لیـــــنین) و (ســــــتالین) و (مۆسۆلینی) و (هیتلەر) و (کیم ئیـل سـۆنغ)ت هـەبێت، کاتێـک دەچیتە بەردەم ئاوێنە؛ گەر بتەوێت بیترسێنی و بیتۆقێنی، یاخود بە خشڵ و زێڕ و زیو و فریوی بـدەی و بیخەڵـەتێنی، یـان زمـانی ڕاستی گرێ بدەی، بۆ ئەوەی ناشیرینیت بە جـوان بنـوێنێ و، بـاڵای کورتـت چـناریی پیشـان بـدات، بـۆت ملکـەچ نابێـت، نـە بـە زەبـر و زەنگـت دەتۆقێت و، نە بە زێڕ و زیوت دەخەڵەتێت.

مرۆڤی بڕواداریش دادوەرە و، عەودالّ و عاشقی یەکسانییە، زوڵـم حەتتا لە شەیتانیش ناکات!.

ئـەوەتا پێغەمبـەرمانﷺ دەربـارەی شـەیتان بـە ئـەبوهورەیرە دەفەرموێت: صدقك وهو كذوب.

واتە: ڕاستی کرد لەگەڵتدا، هەرچەندە درۆزنە.

25

# وێستگەی بیست و پێنجەم

## ئاوێنە چاوەڕوانی سوپاس و ستایش و خەڵاتی تۆ نییە



مرۆڤـی بـڕوادار کاتێـک کـاری خێـر دەکات و، چاوەڕوانی سوپاس و ستایش و خـەڵاتی خـەڵکی نییـە، چـونکە ئـەو مامەڵـە لەگـەڵ خـوای گـەورەدا دەکـات، تـەنها لەبـەرخاتری ئـەو کارەکـانی بـە جـوانترین شـێوە ئـەنجام دەدات، بۆیـە چـاوی تـەنها لـە کـەرەم و پاداشـت و خەڵاتی بێ پایانی ئەوە.

ئەوەتا خوای گەورە بە خۆشەویستمانﷺ دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ ﴾ الأنعام: ٩٠.

ئەی محەمەد، بڵێ من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێت.

تێکڕا پێغەمبەرانیش وەڵامی خاوەن زۆر و زەنگ و دەسەڵات و زاڵمانیان بەم شێوە دەدایەوە: ﴿ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ هود: ٥١.ئەی گەلۆ، لە بەرانبەر ئامۆژگاریی و دڵسۆزیم داوای ماڵ و خەرجیتان لێ ناکەم، پاداشتم تەنها لای خوای گەورەیە.

خوای گەورە لە وەسفی چاکان و دۆستانی خۆیدا دەفەرموێت: ﴿ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ٨ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ﴾الإنسان: ٨ – ٩. تەنها لەبەر خۆشەویستی خوای گەورە، بە هەژار و بێ باوك و دیل، نان و خۆراك دەبەخشن با لایان خۆشەویستیش بێت، پێیان دەڵێن: بێگومان تەنها لەبەر خوای گەورە خواردنتان پێدەبەخشین و، نە پاداشتمان لێتان دەوێت، نە سوپاس.

مرۆڤی ڕاستگۆ و هاوڕێی دڵسۆزیش –ئاوێنە ئاسا– بە زمانی پەیامبەران و خۆشەویستان و یارانی خوا هاوار دەکات: نە پاداشتمان لێتان دەوێ، نە سوپاس.

هاوڕێی ڕاستەقینە، هەژار بێت یان دەوڵەمەند، دەسەڵاتدار بێت یان بێ دەسەڵات، بە هێز بێت یان بێ هێز، ئامۆژگاریی خۆی دەکات و، سەیری پلەوپایە و، دەسەڵات و، هێز و بازووت ناکات، چونکە دڵسۆزە و، بە تەماع و مەبەستی دونیاییەوە نەبووەتە هاوڕێت و، ئامۆژگارییەکانی تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای باڵادەست پێشکەش بە جەنابتان دەکات.



بەڵام هاوڕێی دونیایی و دونیاپەرست هەمیشە چاوی لە گیرفانت یان شیوی چەورت یان دەسەڵاتتە. هەر کاتێك دەسەڵاتت نەما، یان گیرفانت خاڵی بوو، یان چەوری شیوت نەما پشتت تێ دەکات و، وازت لێ دێنێت.

## پەندە شیعر:

تا شیوت چەورە، دێنە دەورت کەس
باوك بێ، برا، ئامۆزا فرەس
داخی داخانم، هەتا گوندۆر بوو
قەوم و قیلەمان، لە دەورە زۆر بوو
بەڵام ئەو کاتەی، گوندۆر بەسەرچوو
تەواوی قەوم و، قیلە بۆی دەرچوو
دۆستی بە ڕاستی، کوا ئەم زەمانە
زۆرترین ڕەفیق، بۆ نان و خوانە
پووڵ هاتە گۆڕێ، زۆر شت دەگۆڕێ
تەنانەت دۆستی، گیانیش دەدۆڕێ
پووڵدار بە کەباب، مل ئەستوور دەبێ
بۆنەکەی بێ پووڵ، پێی ئەستوور دەبێ
ئەوەی پووڵی پێ، پەیین بوو سەرێ
گەڕا لە کەرێ، ناڵەکەی بەرێ



# 26
# وێستگەی بیست و شەشەم

## ئاوێنە نە گەورەت دەکات و، نە بچووکت دەکات ..

گەورە کردن و بچووك کردنی ڕاستییەکان، دوورە لە کاری کەسی بڕوادار، چونکە کەسی بڕوادار ڕاستییەکان وەك خۆیان —بە بێ زیاد و کـەم، یـا بچـووك کـردن و گـەورە کردن— پیشان دەدات.



بەڵام دەبینین، زۆرینـەی خـەڵك لەم خاڵەدا وێرانن، گـەر کەسێکیان بـە دڵ بێـت، زیـاد لـە پێویسـت گەورەی دەکەن و، بە شان و باڵایدا هەڵـدەدەن و، چـاکەکانی گـەورەتر

دەکەن، گەر خراپە و کاری بەد و گوناهیشی هەبێت دەیشارنەوە، گەر پێیان نەکرا بیشارنەوە، بە هەڵەداوان هەوڵ دەدەن بچووکی بکەنەوە و، لەبەرچاوی خەڵکی گوناهەکانی سووك بکەن و، بە بچووکی پیشان بدەن.

بەڵام، خوا نەخواستە کەسێکیان بە دڵ نەبێت، سووك و ڕسوای دەکەن، گەر چاکەی وەك کێوی قەندیلی هەبێت پێی نازانن، یاخود هەوڵ دەدەن بچووکی بکەنەوە و، لە قیمەت و بەهای کەم بکەنەوە.

بە کورتی و بە کوردی: گەر بیانەوێ، کێچێك بە گایەك، یا گایەك بە کێچێك دەکەن.

زمانی زبر و هەجوەکانی شێخ ڕەزامان لە بیر نەچێت، کە هەرکاتێك ویستبێتی زەمی کەسێك بکات کەوڵی کردووە.

بەڵام موفتی پێنجوێنی بەڵێن دەدات لاسایی جەنابی شێخ نەکاتەوە، بۆیە دەڵێت:

ئەگەر شیعرێ بڵێم و نەشری کەم، هیچم لە کەس ناوێ

لە فیکرا پەیڕەوی مەرحوومی زاتی شێخ ڕەزا ناکەم

بەڕاستیی ئەم چەمکە قێزەونەی زیادەڕەویی و کەمتەرخەمیە لە لای شاعیران و ئەدەب دۆستان -بە تایبەت خزمەتکارانی کۆشك و، دار و دەستەی سوڵتانەکان- زیاتر بەرجەستە دەبێت.

لە کاتێکدا شیعر لە شعوورەوە هاتووە و، ئەدەب لە ئەدەبەوە وەرگیراوە و، شیعر و ئەدەب هێمای زەوق و شەوق و جوانی گەردون و، هەستکردنە بە سەختیی بژێو و، ناهەمواریی و تاڵی ژیان.

ئەوە شیعر و ئەدەبە تام بە ژیان دەدەن و، تاڵی ژیانت بۆ شیرین دەکەن، خەمەکانت دەڕەوێننەوە و، جوانیی گەردوون بە جوانیی وشە دەنەخشێنن.

**گوێ لە موفتی پێنجوێنی بگرە و، بزانە چۆن بە شیعر تاڵی ژیان شیرین دەکات و، دەڵێت:**

ئەگەر چی لەحزەیەك دەرد و، غەم و قەهرم بە با نادەم
ئیلاهی زۆر شوکور، ئومێدی نانێ من لە شا ناکەم
لە سایەی زەحمەتی قاچ و، سەر و شان و دەس و ئەستۆم
لە بۆ کەس چاو لە بەر نیم و، خەیاڵی ڕێی ڕیا ناکەم
لە بەر تاڵی زەمانە و، شەربەتی ئەشعاری شیرینم
هەتا ئەم دوو تەعامەم بێ، خەیاڵی شەکر و چا ناکەم!

شاعیر لە وەسف و زەمکردندا دەبێت ئەدەب بپارێزێت، نە لە پیاهەڵداندا زیادەڕەویی بکات و، نە لە شان و شکۆی بەرامبەر کەم بکاتەوە.

مامۆستای هۆزان و گەورەمان جەنابی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە شیعرێکدا دەفەرموێت:

ئەدەب وەسفێکە، هەر بۆ مەرد ئەشێ
نامەرد ئەدەبی، قەت لێ ناوەشێ
دوور بە لەو کەسەی، لە ئەدەب دوورە
ماڵی بێ ئەدەب، ماڵی بێ نوورە

ئەوەتا شاعیرێکیان باسی درێژی لووتی کەسێك دەکات و دەڵێت ئەوەندە درێژە خاوەنەکەی لە قودس لە شاری فەلەستین نوێژی دەکرد، بەڵام لووتی لە مەککە بەدەوری بەیتدا تەوافی دەکرد.

لك أنف طويل أنفت منه الأنوف
أنت في القدس تصلي وهو في البيت يطوف

دەبینین شاعیرەکان لە پیاهەڵدان و وەسفی سوڵتانەکاندا و، گەورەکردنی کارەکانی جەنابعالیان، دەکەونە گێژاوی درۆکردنەوە.

بەداخەوە، هەر لە دێر زەمانەوە بەروبومی زمانی ئەدەب و شیعر لـە زۆر کاتـدا تـەنها بـۆ گێرفـانی سـوڵتانەکان و، لـە بەرژەوەنـدی دیکتاتۆرەکاندا بووە و، شاعیران زۆرجار لەبـەردەم زاڵمانـدا چـۆکیان داداوە.

زۆر لە شاعیران و ئەدەب دۆستان لە دێر زەمانەوە تـا هەنووکـە، قەڵـەم و زمانیـان بـۆ سـتایش و پیاهەڵـدانی جـەنابعالیان تـەرخان کردووە، و هەمیشە گەورەیان کردوون و، بە زیـاتر لـە قـەد و باڵایـان شیعریان هۆنیوەتەوە.

گوێ لە شاعیرێکی وەك (ابن هانئ الأندلسي) بگرە و، بزانە چـۆن وەسف و ستایشی (الخليفة المعز لدين الله الفاطمي) دەکات:

ما شـئتَ لا ما شـاءتِ الأقـدارُ ... فـاحكُمْ فأنـتَ الواحـد القهّـارُ
وكأنّمـا أنـتَ الـنبيُّ محمّـدٌ ... وكأنّمـا أنصـاركَ الانصـارُ
أنـتَ الـذي كانـتْ تُبشّـرنَا بـهِ ... في كُتْبِهـا الأحبـارُ والأخبـارُ
هـذا إمـامُ المـتّقينَ ومـنْ بـهِ ... قـد دُوّخَ الطّغيـانُ والكُفّـار
هـذا الـذي ترجـى النجـاةُ بحبّـهِ ... وبـه يحـطُّ الإصـرُ والأوزار

لە کۆتاییدا دەڵێت:

جلّـتْ صِـفاتُكَ أن تُحَـدَّ بمِقـوَلٍ ... مـا يصـنَعُ المِصْـداقُ والمِكثـار
والله خصّـكَ بـالقرانِ وفضـله ... واخجلـتي مـا تَبلُـغُ الأشـعار

کورتەیەکی واتەی هەندێك لە شیعرەکە:

ئەوەی تۆ دەتەوێت دەبێت، نەك ئەوەی قەدەر دەیەوێت، دەی حوکم بکە چونکە تۆ تەنها و دەسەڵاتدار و حاکمیت، تەنها تۆ بەسەر هەمو شتێکدا زاڵی.

هەر دەڵێی تۆ موحەممەد پێغەمبەری، هەر دەڵێی یاوەرانت یاوەرانی ئەون.

ئەوە تۆی خواناس و شارەزایانی ئایینە ئاسمانییەکان لە پەرتووکە ئاسمانییەکاندا مژدەی هاتنی تۆیان دەدا.

تاوەکو دەڵێت: سیفاتەکانت گەورەترن لەوەی بە قسە و گوفتار دیاری بکرێن، کەسی ڕاستگۆ و زۆر بلێ دەتوانن چی بڵێن لە وەسفتدا؟! لەکاتێکدا خوای گەورە قورئانی تایبەت و تەرخان کردووە بۆ وەسفی تۆ، خەجاڵەت بم شیعرەکان چییان پێ دەکرێ و، چۆن دەتوانن بگەنە چ ئاستێکی وەسفی هەقیقەتی تۆ؟!

هەروەها (ئەبو نەواسی) شاعیر لە وەسفی (هاروونە ڕەشید)دا دەڵێت:

وأخَفْتَ أهْلَ الشِّرْكِ حَتَّى أنَّهُ     لتَخَافُكَ النُّطَفُ الَّتِي لَمْ تُخْلَقِ

ئەوەنـدە بـێ بـاوەڕ و موشـریکەکانت ترسـاندووە تـاوەکو ئـەو دلۆپەی هێشتا دروست نەبووە لێت دەترسێت.

یاخود گوێ لە شاعیرێکی دیکە بگرە چۆن بە شان و باڵی (جمال عبدالناصر)دا هەڵدەدات و، دەڵێ:

بشـرايَ، إنّ صـلاحَ الـدين قـد عـادا     وأصـبحتْ هـذه الأيـامُ أعيـاداً
أجمـالُ، مـا لـك مِـن بـين الأنـام أخٌ     في الشـرق والغـرب ممّـن ينطِـقُ الضـادا
لـو كـان يُعبـد مِـن بـين الأنـامِ فتـىً     كُنّـا لشخصـك دونَ النّـاسِ عُبّـادا

پوختەی واتای شیعرەکە:

مژدە بێت سەلاحەددین گەڕایەوە، ئەم ڕۆژانەمان بوون بە جەژن.

ئەی جەمال، لەنێو مرۆڤدا، نـە لـە ڕۆژهـەڵات و، نـە لـە ڕۆژئـاوا، نموونەت نییە.

ئەگـەر مرۆڤێـک بپەرسـترایە، ئێمـە گشـتمان دەبووینـە بەنـدەی تۆ؟!

یاخود (شفيق الكمـالی) کەڵەشـاعیری ڕژێمـی گـۆڕ بـە گـۆڕ، لێـی دەگێڕنەوە کە لە وەسفی (صەدام)دا وتبووی:

تبـارك وجهـك القدسـي فينـا     كوجـه الله ينضـح بـالجلال

ڕووی گەش و پیرۆزت هەروەك ڕووی خوا، گەورە و پیرۆز و بێ گەردە.

بەڵام دوای چەند ساڵ خزمەتکردنی صەدام، کێشەیەك دەکەوێتە نێوانیانەوە و، صەدام لێی تووڕە دەبێت و دەیکوژێت.

هەمیشە داروودەستە و، هەست نەرم و بێ بەها و ئەرزشەکان تاغوت و دیکتاتۆر دروست دەکەن، هەر ئەوانن سوڵتانەکان گومڕا یا گومڕاتر دەکەن و، تووشی هەڵە و گرفتیان دەکەن.

خۆشەویست ﷺ ئاگادارمان دەکاتەوە کە کەسی دووڕووی زمان لووس و زانا لە گشت کەسێك مەترسیدارترە.[١]

لە جێیەکی تردا خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: گەورەترین شەهید حەمزەیە، لەگەڵ کەسێك بچێتە لای حاکمێکی زاڵم و، ئامۆژگاریی بکات و لە هەق ئاگاداری بکاتەوە و، حاکمیش بیکوژێت.[٢]

---

١- عن عمران بن حصين رضي الله عنهما -مرفوعاً-:"إن أخوف ما أخاف عليكم بعدي:منافق عليم اللسان . رواه أحمد، والطبراني في الكبير.

٢- قال صلى الله عليه وسلم: " أفضل الشهداء حمزة ورجل قام إلى إمام جائر فأمره ونهاه فقتله" . أخرجه الحاكم وصححه.

**نزایەك:** خوایە دوورمان بخەیتەوە لە پیاهەڵدان و سوکایەتی پێ کردن و زمانی زبر و پیسی شاعیرە زمان پیسەکان.

**تێبینی:** بزانە ئەو کەسەی بە شان و باڵتدا دەڵێت و، لەوەی زیاتر کە شایستەی مەدحت دەکات، ئەگەری ئەوەی زۆرە بە ڕەوشتێکی خراپ کە لە تۆدا نییە تۆمەتبار و زەمت بکات.

**ئاوێنە بچووکت ناکاتەوە:**



بچووك کردنەوەی پاڵەوانێك بۆ فس فس پاڵەوان

ڕۆژنامەی (تشاینا دیلی) کە لە (هۆنگ کۆنگ) دەردەچێت هەواڵی ئەوەی بڵاوکردەوە کە چەند کۆگایەکی جلوبەرگ لە وڵاتی چین، بۆ چەواشەکردنی خانمە کڕیارەکان هەڵساون بە بەکارهێنانی جۆرە ئاوێنەیەکی قووڵی هەست پێ نەکراو کە بۆ فریودانی خانمە قەڵەوەکان بەکاردێت، چونکە لەکاتی لەبەرکردنی

جۆرە مۆدیلێکی جلوبەرگی ژنان گەر لە ئاوێنەکاندا سەیری خۆیان بکەن خۆیان بە لاواز دێتە بەرچاو.

ئەم نموونەیە -بەڕاستی- نموونەی زۆر لە مرۆڤی سەردەم و ئەمڕۆمانە، بەتایبەت لە بوونی جیاوازیی ئاستی کۆمەڵایەتیی، یا ڕۆشنبیریی و زانستیی، یا ئاستی ئابووریی و دارایی و...هتد، یا کاتێك لە پڕێکدا دەبنە کوڕێك و، لە هەژاریی دەرباز دەبن و دەبنە سەرمایەدار و خاوەن زێڕ، یا پۆستێك وەردەگرن و دەبنە خاوەن زۆر، ئیتر خۆیان لێدەگۆڕێ و بە چاوێکی نزم سەیری دەوروبەریان دەکەن، بۆیە کاتێك هاوڕێیەکی دێرینیان دەبینن لەبری ئەوەی -هەر وەك جاران و زیاتر- ڕێزیان لێبگرن و، بە چاوی جاران سەیریان بکەن، دەبینین بە زمانی گاڵتە و چاویی سووك پێشوازییان لێ دەکەن و، ڕابردووی



خۆیان پشتگوێ دەخەن و، وەك ئەوەی قەت هەژاریی و نەدارییان نەدیتبێت، یاخود قەت نان و دۆیەکیان بە یەکەوە نەخواردبێت!!.

پەندێکی جوان: کورسی کەس ناگۆڕێت، بەڵکو هەقیقەتی کەسەکان دەردەخات.



گەورە کردنی پشیلەیەك و، بەشێر کردنی

# 27

## وێستگەی بیست و حەوتەم

# • ئاوێنە وەڵامی جنێو و قسەی ناشیرینت ناداتەوە .



ئاوێنە نە جنێو فرۆشە و، نە وەڵامی جنێوەکانت دەداتەوە.

گەر زمانیشی لێ دەربێنیت، دەبینیت لە واقیعدا زمان لە خۆت دەردێنیت؟!

گەر تفی لێ بکەیت، دەبینیت تف لە خۆت دەکەیت.

مرۆڤی بڕواداریش وایە، نە جنێو دەدات و، نە وەڵامی جنێوەکانت دەداتەوە.

مرۆڤی بڕوادار وەك ئاسمان و خۆر وایە، گەر تفیشی تێ کەی تفەکە دەگەڕێتەوە سەر ناوچاوانی خۆت!

کەسێك جنێوی بە یەکێك لە خواناساندا و، خواناسیش لای لێ کردەوە و، پێی وت: دەفتەری کردەوەی خۆتە، بە چی پڕی دەکەیتەوە پڕی بکەرەوە!.

تۆش ئەی جوانترین و ڕێزدارترین دروستکراوی خوای گەورە، ئەگەر کەسێك بەر جنێوی دایت و هەزار قسەی ناشیاوی پێ وتی، خۆت تووڕە مەکە و، ئارامی خۆت لە دەست مەدە.

بە هیچ شێوەیەك بیر لە تۆڵەو، بەرامبەربوونەوەی جنێو بە جنێو مەکەرەوە، چونکە:

- ✓ لاوازەکان: تۆڵە دەکەنەوە.
- ✓ بەهێزەکان : لێبووردەن.
- ✓ مەردان و عاریفان: هەمیشە جنێودانی خەڵکی، پشتگوێ دەخەن و، بیری لێ ناکەنەوە.

لە عارفێکیان پرسی: بۆ تۆڵە لەو کەسانە ناکەیتەوە کە لەگەڵتدا خراپن و، بەر جنێوت دەدەن؟! بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی: ئەگەر گوێدرێژێك جووتەیەکت لێدا، جووتەی لێ دەدەیتەوە؟!.

هەمان پرسیاریان لە عارفێکی دیکە کرد، ئەویش لە وەڵامدا پێی فەرموون: ئایا بە حیکمەت و دانایی دەزانن هەر سەگێگ لێت بوەڕێ و قەپت لێ بگرێ، تۆش لێی بوەڕیت و، قەپی لێ بگریت!!.

## حیکمەتێکی زێڕین:

لوتکەی ئازایەتی ئەوەیە، لەکاتێکدا گاڵتەت پێ بکەن و قسەت پێ بڵێن، ددان بە جەرگی خۆتدا بنێیت و، بێدەنگ بیت، چونکە خۆت هەم ئەوان و هەم خۆیشت دەناسیت.

بەڵام گەر ئاوێنە بشکێنیت بەرگری دەکات و، ئەگەری ئەوە هەیە بریندارت بکات.

گەر بریندایشت نەکات لە دڵیدا ناشیرین دەبیت، بۆیە بە ناشیرینیی و شێواویی خۆت تیایدا دەبینیتەوە.

## سەرەداوێك:

ئاوێنە مەشکێنە، چونکە ئەگەر شکا لەلایەکەوە وێنەی خۆت دەشێوێنیت و، لەلایەکی دیکەوە کەسێکی دڵسۆز و هاوڕێت لەدەست

دەدەیت و، بێبەش لە ڕاوێژکاریی و پەند و ئامۆژگارییەکانی دەبیت و، لەلایەکی سێیەمەوە کە شکا ئەستەمە وەك خۆی لێبێتەوە.

تۆش برای شیرین و خوشکی ڕێزدارم: دڵی کەس –بەتایبەت دۆستان و نزیکانت– مەڕەنجێنە، چونکە کە دڵ ڕەنجا ئەستەمە وەك خۆی لێ بێتەوە.

بە پێچەوانەی ئاوێنەوە شێخ ڕەزا دەڵێ:

ئەگەر حەملە بکەی، مەدحت دەکەم من

جەزای قەولی درۆ، با هەر درۆ بێ

**وێنەی شکاندنی ئاوێنەکەت:**



28

# وێستگەی بیست و هەشتەم

## ئاوێنە دادپەروەرە و، بێ جیاوازی حوکم دەدات.

ئاوێنە دادپەروەرە، بۆیە بە بێ جیاوازی حوکمی خۆی دەدات و، بە یەك چاو سەیری گشت دەکات، گشت مرۆڤەکان لەبەرامبەریدا یەکسانن، جیاوازیی نییە لەنێوان ڕەش و سپی، دەوڵەمەند و هەژار، وەزیر و گزیر، نێر و مێ، کورد و عەرەب، بڕوادار و بێ بڕوا.



جوانیی گشتیان پیشان دەدات.

لە ناشیرینیش ئاگاداریان دەکاتەوە.

بە دژی خۆشی هیچ کەسێك، ناڵێ ترشە و، بە دژی ترشیان ناڵێ خۆشە، ترش لای هەر ترشە و، خۆشیش لای هەر خۆشە ! !

خۆشەویستیشﷺ دەفەرموێت:

هۆ خەڵکینە، پەروەردگارتان یەکە، باوکتان یەکە، نە عەرەب زیادی بەسەر ناعەرەبدا هەیە و، نە ناعەرەب بەسەر عەرەبدا، وە نە سوور بەسەر ڕەشدا و، نە ڕەش بەسەر سپیدا، جگە تەقوا و لە خوا ترسان نەبێت، کێ زیاتر لە خوا ترسە ئەوە باشترە.[1]

---

١- مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار،حديث رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم: عن أبي نضرة، حدثني من سمع خطبة رسول الله صلى الله عليه وسلم في وسط أيام التشريق فقال: " يا أيها الناس، ألا إن ربكم واحد، وإن أباكم واحد، ألا لا فضل لعربي على عجمي، ولا لعجمي على عربي، ولا أحمر على أسود، ولا أسود على أحمر، إلا بالتقوى أبلغت "، قالوا: بلغ رسول الله، ثم قال: " أي يوم هذا ؟ "، قالوا: يوم حرام، ثم قال: " أي شهر هذا ؟ "، قالوا: شهر حرام، قال: ثم قال: " أي بلد هذا ؟ "، قالوا بلد حرام، قال: " فإن الله قد حرم بينكم دماءكم وأموالكم " قال: ولا أدري قال: أو أعراضكم، أم لا كحرمة يومكم هذا، في شهركم هذا، في بلدكم هذا أبلغت "، قالوا: بلغ رسول الله، قال: " ليبلغ الشاهد الغائب ".

هاوڕێی ئاوێنە ئاسا وەك هەتاوە، وەك ئاوە، وەك ئۆكسجینە.

سوود و قازانجی بۆ گشت بوونەوەرە، بە مرۆڤ و گیاندار و بێ گیانەوە.

قەت نەمان بیستووە و نایشی بیسین، هەتاو یا ئاو یا ئۆكسجین، سوود و قازانجییان تەنها بۆ كەسێك، یا چینێك، یا میللەتێك، یا ئایین و ئایینزایەك قۆرخ بكەن.

نەبیستراوە و نایشبیسرێت، خۆر لەكاتی هەڵهاتنیدا ڕووبكاتە مرۆڤەكان و پێیان بڵێت:

ئەی خەڵكینە، من تەنها بۆ بڕوادار، یا بۆ دەوڵەمەند، یا بۆ كورد یا عەرەب یا تورك یا ئینگلیزی، یا بۆ پیاوان دروستكراوم و، جگە لەوان سوود بە كەس ناگەیەنم!

هەروەها ئاو و ئۆكسجینیش!

مرۆڤی بڕواداریش بەهەمان شێوە بە یەكسانیی و بێ جیاوازی سوودی بۆ گشت بوونەوەر دەبێت، پێ بە پێی خۆشەویستمان ڕوو لە گشت بوونەوەر دەكەین و، قازانجیان پێ دەبەخشین!

ئەوە كەسە لاوازەكانن لەكاتی سوود گەیاندندا پرسیاری ڕەگەز و شوناس و میللەت و ئایین و.. هتد دەپرسن! تەنها سوود بە هاوبیر و ئایدۆلۆژیا و نەتەوە و ڕەگەزی خۆیان دەگەیەنن، چاویان تەنها

دەسەڵاتدار و دەڵەمەند و گیرفـان پـڕ و گیرفـان بڕەکـان دەبینێـت!
گوێیان تەنها قسەی دەسەڵاتداران دەبیسێت، زاریان تـەنها سوپاسـی زلهێزان، یان هاوبیر و هاوشێوەی خۆیان دەکات.

هـەژاریش ملـی دەشـکا، بـۆ هـەژارە، نـەداریش قـولی دەبـڕا بـۆ نەدارە! عەرەبیش لە مێژە وتویانـە: (الـدراهم مـراهم)، واتـە: درهـەم مەڵهەمە!

حەسـەنی بەصـری کاتێـك دەبینـێ چـەند جەندرمەیـەك پـەلی دزێکیان گرتووە و بەرەو باچاوەشی دەبەن فەرمووی: سـەیرە! دزی شەو دەگرن و، بەرەو دزی ڕۆژی دەبەن!!

لە زەمەنی خۆشەویستداﷺ ئافرەتێك دزیی لێ ئاشکرا بوو، بەڵام چونکە ئافرەتێکی چینی وەجاخزادە و دەوڵەمەند و خـاوەن هـۆزێکی ناوداری وەك بەنی مەخزووم بوو، قورەیشییەکان پێیان نـاخۆش بـوو سـزا بـدرێت، بۆیـە چـوونە لای خۆشەویسـتی کـوڕی خۆشەویسـت، ئوسـامەی کـوڕی زەیـد -ڕەزای خـوای لێ بێـت-، بـۆ ئـەوەی لای پێغەمبەری ئازیزﷺ تکای بۆ بکات و، سزا نەدرێت، ئازیزمانﷺ بـەم کارە زۆر تووڕە بوو و، فەرمووی: ئەوەی گەلانی پـێش ئێـوەی لـەناو بـرد ئـەوە بـوو، گـەر کەسـێکی نـاودار و وەجـاخزادە دزیـی بکردایـە کاریان نەدەبوو بەسەریەوە، بـەڵام گـەر کەسـێکی هـەژار و لاواز دزی

بکردایە سزایان دەدا، سوێند بەخوا گەر فاتیمەی کچی محەمەد دزی بکات دەستی دەبڕم.[1]

## دیالۆکی قانع و فلس:

### قانع:

ئەی فلس وەڵڵا لە داك و، باب و باپیر چاتری
تۆ لە دووسەد خزم و خوێش و، شێخ و دەسگیر چاتری
هەی بە قوربانی زڕەت بم، ڕۆژی سەودا و مامەڵە
تۆ لە شیر و خەنجەر و، برنەو گەلێ ئازاتری
وابزانم بێ ئەدەب نابم، ئەگەر ئەمڕۆ بڵێم
تۆ لە لوقمان و ئەرەستۆ، عالم و داناتری

---

١- صحيح البخاري – كتاب أحاديث الأنبياء، باب حديث الغار: عن عروة، عن عائشة رضي الله عنها، أن قريشا أهمهم شأن المرأة المخزومية التي سرقت، فقالوا: ومن يكلم فيها رسول الله صلى الله عليه وسلم ؟ فقالوا: ومن يجترئ عليه إلا أسامة بن زيد، حب رسول الله صلى الله عليه وسلم فكلمه أسامة، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " أتشفع في حد من حدود الله، ثم قام فاختطب، ثم قال: إنما أهلك الذين قبلكم، أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد، وايم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها ".

من به چاوی خۆم ئەبینم، کەمتیارت کرد بە شێر
بەینی بەینەڵڵا لە خواجە و، فەیلەسوف وریاتری
چەن زەبەلاح و قورمساخ و، تەڕاحەت کرد بە پیاو
جا کە وابوو تۆ لە خوێندن، چاتر و باڵاتری
کلکی کەر بەرز کەیتەوە، ئەیکەی بە پێشەنگی قەتار
ئافەرین بۆ تۆ فلس، بێ شك لە من داناتری

## وەڵامی فلس:

قانعا، گشت کەس ئەزانێ، تۆ کزۆڵە و سەرکزی
تۆ لە گشت کەس بێ فلوس و، بێ دەس و ڕیسواتری
کاکە ئانە و مامە درهەم، کۆمەکم بن بێمە لات
تۆ لە جەم جەمتر، لە دارا بێ خەم و داراتری
ئێستەکانێ چۆن جەنابی من لە تۆ دوورم تەواو
تۆ لە ڕێوی گەڕ خراپتر، لات و بێ عەنواتری
خوا نەخواستە دەفعەیێ، نەقشم ببینی تۆ بە خەو
جا ئەزانم چۆن لە گشت کەس، هار و بێ مەعناتری

## دوو شیعری عەرەبی:

یەکەم:

إن الغـــني إذا تكلـــم بالخطـــأ قـــالوا أصـــبتَ وصـــدَّقوا مـــا قـــالا

وإذا الفقـــيرُ أصـــاب قـــالوا كلـــهم: أخطـأتَ يـــا هـــذا، وقلـــت ضـــلالا

إن الـــــدراهم في الأمـــــاكن كلـــــها تكســـو الرجـــال مهابـــةً وجمـــالا

فهـــي اللســـانُ لمـــن أراد فصـــاحةً وهـــي الســـلاح لمـــن أراد قتـــالا

دووەم:

يمشـــي الفقـــير وكـــل شـــيء ضـــده والنـــاس تغلـــق دونـــه أبوابهـــا

وتـــراه ممقوتـــاً ولـــيس بمـــذنب يـــرى العـــداوة لا يـــرى أســـبابها

حتـــى الكـــلاب إذا رأت ذا غنيـــة أصـــغت إليـــه وحركـــت أذنابهـــا

وإذا رأت يومـــاً فقـــيراً ماشـــياً نبحـــت عليـــه وكشـــرت أنيابهـــا

**نموونەیەکی واقیعی:**

پرۆسـەی فرەژنیـی شـەرعی خودایـە و، کـەس ناتوانێـت ڕێگـری لێبکات، بەڵام دەرگای ئەم پرۆسەیە هەمیشە و بۆ هەموو کەسێك واڵا نییە، بەڵکو مەرجی خۆی هەیە، مـەرجی دادپـەروەریش لەسـەرووی گشت مەرجەکانی دیکەوەیە، لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبیـنین هەنـدێك لـەو کەسـانەی هانـا بـۆ فرەژنـی دەبـەن، بـەپێی شـەرعی پـەروەردگار ناجوڵێنـەوە و، لـە مامەڵـەکردنیان لەگـەڵ هـەردوو هاوسـەرەکانیاندا

دادپـەروەریی و یەکسـانیی ڕەچـاو ناکـەن، بـەڵکو هاوسـەری دووەم هەمیشـە لـە پێشـەوەیە و، دەکرێتـە دەمڕاسـتی هـەردوو خێـزان و، پیاوی ترسنۆك لەبەردەم ژنی دووەم و، زاڵم لەبەرانبەر ژنی یەکەمـدا، لەبەردەم ژنی دووەمدا دەبێتـە گوێڕایـەڵێکی بـێ کێشـە و ڕەخنـە و، جگە: بەڵێ چاوەکەم، بەڵێ قوربـان، چیت فـەرموو دڵەکـەم، بەسـەر چاو و بەسەر سەر و ڕۆحەکەم نەبێت هیچ زمانێکی دیکەی نییە.

بەڵام لەگەڵ خێزانی یەکەمـدا خـۆی لێدەبێتـە پاڵـەوان و، دەمـی شڕی دەکرێتەوە و، سەری زێرابی بۆگـەنی لەسەر زاری پڕ لە ژاری لادەدات و، تەنها بە وشەی زبـر و جنێـودان و بۆڵـە بـۆڵ و ئـازار و ئەشـکەنجەدان لەگەڵیدا کات دەباتە سەر.



# 29
## وێستگەی بیست و نۆیەم

### • ئاوێنە: هەر کەس داوای هەڵسەنگاندنی لێ بکات هەڵی دەسەنگێنێت.



هــەر وەك چــۆن ئاوێنــە کــاری بــە پیشــەو ڕەگــەز و ئاســتی بــژێویی خــەڵکی و دەوڵەمەندیی و هەژاریی و هۆز و نەتــەوە و زمــان و جوانیی و ناشیرینی خەڵکییــەوە نییــە و، هەرکــەس داوای ئامۆژگــاریی و هەڵســەنگاندنی لێ بکــات بــەخیلیی و ڕژدیی لەگەڵدا ناکات و، ئامۆژگاریی و هەڵسەنگاندنی خۆی پێشــکەش دەکات، کەسی دڵسـۆز و بـە ئەمـەکیش بـە هـەمان شـێوە خزمـەت و ئامۆژگاریی و هەڵسەنگاندنی خۆی پێشکەش بە خەڵکی دەکات.

کەسی ئاوێنە ئاسا وەك پزیشکێکی دڵسۆز و دەستپاك و پابەند بەو سوێندەی لە ئاهەنگی دەرچوونیدا خواردوویەتی چۆن بەبێ جیاوازی هەر نەخۆشێك بڕواتە لای و، کاری پێویستی بۆ ئەنجام دەدات و، بە بێ درێغی هەوڵی دۆزینەوەی نەخۆشیی و، بیر لە ڕێگا چارە و، دیاری کردنی دەرمانی پێویست و شیاو دەکاتەوە، بەبێ ئەوەی بیر لە پیشەو ڕەگەز و دەوڵەمەندیی و هەژاریی و هۆز و نەتەوە و زمان و جوانیی و ناشیرینی نەخۆشەکانی بکاتەوە، بەڵکو پزیشکی مرۆڤ دۆست هەمان خزمەت پێشکەش بە دوژمنەکانیشی دەکات، لەکاتی چارەسەرکردنی دوژمنەکانی بیر لە ڕابردووی قێزەون و پڕ لە ئاخ و ئۆف و زوڵمیان ناکاتەوە، بەڵکو وەك مرۆڤ مامەڵەیان لەگەڵ دەکات.

پاڵەوانی ناوداری جیهانیی بە ڕەچەڵەك کورد (سەلاحەددینی ئەیوبی) لە مەیدانی جەنگدا دەبیستێت سەرکردەی سەرسەختی خاچ پەرستەکان (ریتشارد) ناسراو بە دڵی شێر نەخۆشە، بۆیە پزیشکی تایبەتی خۆی بۆ دەنێرێت و، چارەی دەکات!! خۆشەویستیشﷺ کاتێك دەبیسێت خەڵکی مەککە ڕووبەڕووی وشکەساڵیی و قات و قڕیی دەبنەوە، لە شاری مەدینەی پیرۆزەوە کاروانی یارمەتییان بۆ دەنێرێت، لە کاتێکدا ئەو خەڵکە هەمان ئەو خەڵکەن کە خۆیی و یارویاوەرانییان شار بە دەرکردوون و، ئازار و ئەشکەنجەیان داون!!

# 30

## وێستگەی سییەم

# ئاوێنە کەس ناتوانێ کاری تێ بکات

ئاوێنـە: نـە بـە پـارە و پـوول و تـەماع خسـتنە بـەر و پلەوپایـە دەخەڵـەتێت و، نـە بـە تـۆپ و تـەیارە و، کـۆت و زنجـیر و، تـرس و تۆقاندن دەترسێنرێت، بۆیە هیچ هێزێك ناتوانێت کاری تێ بکات.

مرۆڤی بڕواداریش بەهەمان شێوە، جگە ڕەزامەندیی پـەروەردگار هیچ مەبەستێکی نییە و، چاك دەزانێت کەس توانـای خـەڵات کـردن و ڕۆزیی زیادکردنی نییە گەر پەروەردگار ڕازی نەبێت.

هـەروەها کـەس توانـای سـزادان و کوشـتن و بـڕین و کـەمکردنی ڕۆزیی نییە گەر پەروەردگار بڕیاری لەسەر نەدابێت.

مرۆڤی بڕوادار دڵنیایە کە پارە چڵکی دونیایە و، مەرج نییە هـۆی کامەرانیی بێت.

جاری واهەیە دونیا بوەتە هۆکاری نەگبەتیی و نەهامەتیی و سەر ئێشە و دەردەسەریی.

هەژاریش بووەتە هۆکاری ڕزگاربوون لە شەڕ و ئاژاوە و نەهامەتیی.

دونیا لای مرۆڤی بڕوادار وەك هۆکارێك بۆ بەدەستهێنانی چاکە و خێرکردن و ڕەزامەندیی پەروەردگار سەیر دەکرێت، بۆیە بۆ بەدەستهێنانی هەوڵی خۆی دەدات، بەڵام نایەڵێت لە دڵیدا هێلانەی خۆی بکات، بەڵکو تەنها لە دەستیدا دایدەنێت.

هەر شتێکیش تەنها لە دەستدا بوو و، لە دڵدا جێی نەبێتەوە بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت کاریگەری لەسەر دڵ هەبێت.

## ماڵی دونیا:

- بە ماڵی دونیا پەرتووك دەکڕیت و پەرتوکخانەی گەورە بونیات دەنێیت... بەڵام زانست و مەعریفە ناکڕیت.
- چارەخانە دروست دەکەیت، بەڵام نابیتە پزیشك و، چارەی نەخۆشت پێ ناکرێت.
- بۆ بەدەستهێنانی ماڵی دونیا تەمەنی جوانیی و لاویی خۆت لە دەست دەدەیت، بەڵام ناتوانیت چرکەیەك، یا میلی چرکەیەك، یا

نانۆ چرکەیەك، یا ڤیمتۆ چرکەیەك و کەمتر لەوەش تەمەنت زیاد بکەیت، یا تەمەنی لاویت بگەڕێنیتەوە.

- بۆ بە دەستهێنانی ماڵی دونیا تەندروستیی و لەش ساغی خۆت لە دەست دەدەیت، بەڵام گشت مولکی دونیا تەندروستیت پێ نابەخشێتەوە.

## داستانی شێخی شازلی:

کابرایەکی هەژار شێخ ئەبولحەسەنی شازلی -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەبینێت، بەڵام چۆن بینینێك! بە جلوبەرگێکی جوان و بۆنێکی خۆشەوە، بۆیە بەلایەوە سەیر دەبێت چۆن مرۆڤی پیاوچاك و نزیکی پەروەرگار جلی جوان لەبەر بکات و بۆنی خۆش لە خۆی بدات، ئەمەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی بە زمانێکی زبرەوە ڕەخنە لە شێخی شازلی بگرێت، ئەویش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: (یا هذا، ثیابي تقول: الحمد لله، وثیابك تقول: أعطوني مما اعطاکم الله).

جلوبەرگی من هاوار دەکات و دەڵێ: سوپاس بۆ خوا، بەڵام جلوبەرگی جەنابتان هاوار دەکات: خەڵکینە، لەوەی خوا پێی بەخشیون پێم ببەخشن.

## حیکایەت:

هەبوو نەبوو، پاشایەك هەبوو، لە بری ئەوەی دڵی بە شانشین و مەملەکەتە بێ کێشە و گرفتەکەی خۆش بێت، هەمیشە بە دڵتەنگیی و غەمباریی دەبینرا، سەرلەبەیانییەك بە دەنگی زوڵاڵ و گۆرانیی باغەوانی هەژار بە ئاگا هات و، لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە تەماشای مام باغەوانی کرد، بینی هەموو گیانی خۆشیی و زەردەخەنە و پێکەنینی لێ دەبارێت، سەری لە کاری مام جوتیاری باخەوان سوڕما، بەو هەژاریی و نەدارییەوە چۆن دەتوانێت دڵی خۆش بێت و پێبکەنێت و گۆرانی بچڕێنێت؟!

بۆیە کابرای باخەوانی بانگکرد و، لە نهێنی ئەو دڵخۆشییەی پرسی، مامی باغەوان لە وەڵامدا وتی: من بابایەکی هەژارم و خاوەنی خێزانێکی حەوت سەر کلفەتیم، لە دوو ژووردا جێی خۆمان کردووەتەوە، بەڵام لای جەنابتان ئیشی خۆم دەکەم و، ئەوەندەم دەسدەکەوێت بەشی بژێویی خۆم و خێزانە هەژارەکەم بکات، هەر ئەوەندە نانێکی ڕەق لەسەر سفرەکەماندا هەبێت پێی بژین و نەمرین، دەبێت بەختەوەر بین و شوکری پەروەردگار بکەین، ئێمە هەوڵی خۆمان دەدەین و کار دەکەین، بەڵام پەروەردگار چەندی بۆ نووسیبین پێی ڕازین و، شوکری دەکەین.

جەنابی پاشا زیاتر لە کاری باخەوان سوڕما و، جـەنابی وەزیـری بانگ کرد و ماجەرای باغەوانی بـۆ گێڕایـەوە، وەزیـری دانـا داوای لـە پاشا کرد ئەگەر دەیەوێت نهێنی ئەم دڵخۆشیە بزانێت با نـەوەد و نـۆ (٩٩) لیرە زێڕ بخاتە ناو کیسێکەوە و لەسەر ڕێگای باخـەوان دایبنـێ و، کەسێکیش بە نهێنی چاودێریی بکات.

مـامی باخـەوان کاتێـك کیسـەکەی دۆزیـەوە لـە خۆشـیدا زەوی نەیدەگرتە خۆی، بەخێرایی بەرەو مـاڵ گەڕایـەوە و، هـەواڵی خۆشـی دۆزینەوەی کیسەی زێڕی بە خێزانەکـەی ڕاگەیانـد و، دڵـی ئەوانیشـی خۆشکرد.

کاتێك خەویان لێ کـەوت، بـە نهێنـی کیسـە پـارەی لـەژێر سـەری خۆیدا دەرهێنا و، لە سوچێکدا دەسـتی بـە ژمـاردنی سـکە زێڕەکـان کرد، بەڵام ئەوەی جێی تێڕامان و پرسیار بوو ئەوە بوو ژمارەی لـیرە زێڕەکـان ٩٩ بـوو، دووبـارە و سـێبارە و چـواربارە ژماردنییـەوە، ژمارەیان زیادی نەکرد، لە دڵـی خۆیـدا دەیگـوت: دەبێـت سـەد لـیرە بێت، ماقوڵ نییە نەوەد و نۆ بێـت، گومـانی ئـەوەی بـۆ دروسـت بـوو دانەیـەکیان کەوتبێتـە خـوارە، بۆیـە تـا کـاتێکی درەنـگ سـەرقاڵی پشکنینی کون و قوژبنی خانووەکەی بوو، بەڵام بـە داخـەوە شـتێکی چنگ نەکەوت، بۆیـە بڕیاریـدا سـبەینێ زوو لـە خـەو هەڵسـێت و، زوو

بچێته سەر کار و، بۆ بەدەستهێنانی لیرەیەك کاری زیاتر بکات، بەڵکو لیرەکانی بگەیەنێتە سەد لیرە و، خۆیی و خانەوادەی بەرێزیان ئاسوودە بکات.

بەڵام لەبەر ماندوبوونی شەو و، درەنگ نووستنی، درەنگ لە خەو هەستا، بۆیە زۆر تورە بوو و، دەستی کرد بە جنێودان و، تووڕەیی خۆی بەسەر خێزان و ماڵ و منداڵی بێ تاواندا دەباران، بەپێچەوانەی جارانەوە لەبری ماچکردنی منداڵەکانی و باراندنی پێکەنین و زەردەخەنە و خوداحافیزی بە ڕوویاندا، بە زمانی پڕ لە جنێوەوە لەماڵ بەرەو جێی کاری کەوتە ڕێ.

بەڵام هەرچەند دەکات لەبەر ماندووبوون و شەکەتیی کاری بۆ ناکرێت و، مێشك و بیریشی بە بەدەستهێنانی لیرەی زێڕەوە سەرقاڵە، بۆیە ناتوانێ وەك پێویست کارەکەی ئەنجام بدات و، وەك جاران بە دەنگە زوڵاڵەکەیشی گۆرانی بڵێت.

جەنابی پاشا بەم شێوەیە قیمەتی ڕازی بوون و قایل بوونی بۆ دەرکەوت و، دانی بەوەدا نا کە دونیا مەرج نییە کامەرانیی و بەختەوەریی بە مرۆڤ ببەخشێت.

# 31

## وێستگەی سی و یەکەم

# ئاوێنە بە دوای هەڵەکانتدا ناگەڕێت، بەڵکو تەنها ئەوەت پێ دەڵێ کە بە چاوی خۆی بینیویەتی

تۆش ئەی مرۆڤی وشیار ئاگاداربە:

یەکەم: واز بێنە لە "وتی وتیان" و، لە خراپە باسکردنی خەڵکیدا باوەڕ بە کەس نەکەیت، و تەنها چاوی خۆت بکەرە دادوەر.

دووەم: ئەوەندە عەودالّ و تامەزرۆی گەڕان و پشکنین بەدوای خراپە و نهێنییەکانی خەڵکی مەبە، بەڵام ئەوەی جێی داخە زۆر کەس هەن کۆڕ و کۆمەڵیان تەنها بە خراپە باسکردنی خەڵکی گەرم دەکەن، لەکاتێکدا کەسیان ئەو جۆرە خراپەیان بە چاوی خۆی نەبینیوە، بەڵکو تەنها لەملاولا بیستویانە، زۆرێك لەو کەسانەش کارو کاسبییان

بووەتـە تـەنها پشـکنین و گـەڕان بـەدوای هـەواڵی نـوێی ناوزڕانـدنی خەڵکی لە ڕۆژنامەو گۆڤار و ماڵپـەڕە جـەیا بـەرە جیاجیاکـانی تـۆڕی زانیـاری جاڵجاڵۆکـەیی ئینتەرنێتـدا، بـەو ئومێـدەی بابـەتێکی تـازە و نوێیان بۆ گـەرمکردنی کـۆڕ و بـەزم و سـەفایان بـە دەسـت بکـەوێت، لەدواییدا لە ڕێگـەی مۆبایلـەوە بـڵاوی بکەنـەوە، بـەبێ ئـەوەی گـوێ بدرێتە ڕاستی هەواڵ و ڕاستگۆیی سەرچاوەی هەواڵ!!!

خەڵکی لەم سەردەمەدا وایـان لێ هـاتووە کاتێـك بـە چـاکە نـاوی کەسێك بێنیت و، مەدحی بکەیت، باوەڕت پێ ناکەن، بەڵام ئەگەر بـە خراپە باسی بکەیت زۆربەی خەڵك بـاوەڕ دەکـەن و، دەهـۆڵی بـۆ لـێ دەدەن و، دەیکەنە بنێشتە خۆشەی سەرزاریان.

خۆشەویسـتﷺ دەفـەرموێت: ئـەی ئـەو کەسـانەی بـە زمـان باوەڕیان هێناوە و، بـڕوا نەچـوەتە دڵیانـەوە، غەیبـەتی موسـوڵمانان مەکـەن و، بـەدوای هەڵـەو نهێنییەکانیانـدا مەگـەڕێن، چـونکە ئـەو کەسـەی بـەدوای نهێنییەکانیانـدا بگـەڕێت خـوای گـەورەش بـەدوای نهێنییەکانیـدا دەگـەڕێت و، هەرکەسـێکیش خـوای گـەورە بـەدوای نهێنییەکانیدا بگەڕێت، لە کونجی ماڵیشیدا بێت ئابڕووی دەبات!!![1]

---

١- "یا معشر من آمن بلسانه، ولم یدخل الإیمان قلبه، لا تغتـابوا المسـلمین، ولا تتبعـوا

ئیمامی غەزالیش -بەڕەحمەت بێ- دەفەرموێت: گەر کەسێك دەرگای لەسەر خۆی داخست و، بە نهێنی گوناهی دەکرد، دروست نییە سیخوڕی لەسەر بکەیت، چونکە خوای بالآدەست دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾الحجرات: ١٢، هەروەها دروست نییە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن هەوڵی زانینی گوناهەکەی بدەیت و، گوێقولاخی چپە و نهێنییەکانی ببیت.

ئەگەر بەچاوی خۆت گوناه و گوناهباریش ببینی دروست نییە بانگەشە و ڕیکلامی بۆ بکەی، بەڵکو دەبێت بەپێی توانا هەوڵی چاکسازیی و نەهێشتنی ئەو گوناهە و، دەسگرۆیی ئەو گوناهبارە بدەیت، نەك ناوی بزڕێنیت و حەیای بەریت.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾النور: ١٩.

بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن خراپە و زینا و کاری ناشیاو لە نێو بڕواداراندا بڵاوببێتەوە سزای پڕ ئێش و ئەشکەنجەی دونیا و ئاخیرەتیان بۆ هەیە.

---

عوراتهم، فإنه من اتبع عوراتهم يتبع الله عورته، ومن يتبع الله عورته يفضحه في بيته " سنن أبي داود - كتاب الأدب- باب في الغيبة عن أبي برزة الأسلمي.



نەخۆشییەك لە نەخۆشییە مەترسیدار و ترسناكەكانی سەدەی بیست و یەكی تەكنۆلۆژیا و پێشكەوتنی ماددی نەخۆشی فەزاحەتسازییە، كە وەك شێرپەنجە بە گشت دەمارەكانی گشت چین و توێژی مرۆڤایەتیدا تەشەنەی كردووە و بڵاوبووەتەوە، زۆربەی دام و دەزگا و میدیاكان سەرقاڵی گەڕان بەدوای كارێكدان ئابڕووی

بەرامبەری پێ ببەن، با کارێکی کۆنی پێش هەزارەها ساڵیش بێت، بێ گوێدانە بەهای بەرز و داب و نەریتی ڕەسەن و جوانی مرۆڤایەتی.

ئەوەی جێی داخ و کەسەرە ئەوەیە کە هەزار گوتاری زانستیی و کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنگەریی ئەوەندەی گرتەفیدیۆیەك یا هەواڵێکی ئابڕووبەری درۆی پڕوپووچ لەناو خەڵکیدا ڕەواجی نییە!

بۆیە زۆر لە میدیا و دام و دەزگاکان ئەم کارەیان کردووەتە پیشەی سەرەکیی خۆیان و، سەرکەوتووترین ڕێگایە بۆ پڕکردنی گیرفان و، بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری ئەو دام و دەزگایانە.

زۆرجاریش دەردەکەوێت کە ئەو هەواڵانە هیچ بنەمایەکی ڕاستییان نییە و، لە واقیعەوە دوورن!

لە ئەمریکا (مۆنیکا لویسکی) ڕاهێنەری پێشووی کۆشکی سپی، ئابڕووچوونی نێوان خۆی و (بیل کلنتۆن)ی سەرۆکی پێشووتری بۆ فرۆشتنی (١٠٠) ملیۆن دانە لە کتێبەکەی قۆستەوە.

بازرگانێکیش سوودی لەم ئابڕووبردنە وەرگرت و، (٢٠) ملیۆن دۆلاری لە جگەرەی مۆنیکا قازانج کرد.

لە کوردستانی خۆشماندا تاك و دام و دەزگا و میدیاکان هەمیشە پشکنین بە زبڵدانی تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی ئینتەرنێتدان بۆ بەدەستهێنانی هەواڵێکی ئابڕووبەر.

لای هەموویش ئاشکرایە کە ئاسەواری هەواڵێکی ئابڕووبەر بەهیچ جۆرێك ناسڕێتەوە، بۆ نموونە گەر پەیجێکی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەك فەیسبووك و تویتەر هەواڵێکی ئابڕووبەر لەسەر کەسێك بڵاوبکەنەوە، لە ماوەیەکی کەمدا سەدەها هەزار جار لایك دەکرێت و بە جیهاندا بڵاودەبێتەوە و، هەزارەکان دەبنە ملیۆنەها و زیاتریش.

بەڵام دوایی دەردەکەوێت هەواڵەکە درۆ و دروستکراو بووە، کاتێك هەواڵەکە ڕاست دەکرێتەوە و، ئەستۆپاکیی بۆ کەسە ئابڕووبراوەکە دەکرێت، هەواڵی ئەستۆپاکیی لە بڵاوبوونەوەدا هەمان خێرایی هەواڵە ئابڕووبەرەکەی نابێت، لە متمانە پێکردنیشدا وەك ئەو نابێت، لە هەزاری ئەو کەسانەی هەواڵە ئابڕووبەرەکەیان بیستووە و باوەڕیان پێکردووە، تەنها یەك و دووان و سیان باوەڕ بە هەواڵی دووەم دەکەن کە ئەستۆپاکیی بۆ کەسی ئابڕووبراو جاڕ دەدات. ئیتر کار لەکار دەترازێت و، هەرچی هەوڵبدەیت بۆت ڕاست ناکرێتەوە.

**پەندی پێشینان:**

**بەردێك نەزان بیخاتە گۆمێکەوە بە سەد زانا دەرنایەت.**

# 32

## وێستگەی سی و دووەم

## ئاوێنە بە پێچ و پەنا نییە، بەڵکو ڕوون و ئاشکرایە

تـۆش ڕوون و ئاشـکرابە و، بـە پـێچ و پـەنا مەبـە، بـەڵکو بەشـێوەیەکی ڕوون و ئاشـکرا هەڵسـەنگاندنی بەرامبـەرت بکـە و، بـە ڕاشکاوی خاڵە ئەرێیی و نەرێییەکان بخەرەڕوو.

زۆرجـار دەبیـنین کاتێـك داوای هەڵسـەنگاندن و ئامۆژگـاری لـە هەندێ هاوڕێ و خزم و دۆستانت دەکەیت، هەزار و یەك شێر و ڕێـوی و بگرە و بەردە دەهێننەوە و، ئەوەندە بە ئاڵۆزی و پێچ و پەنا قسـە دەکەن و دێنەگۆ سەرت لێ دەشێوێنن و، قسەکانیان لـە دێـو جامـەی کەو گرتن دەچێت و، هـەر پینـەی لـە ڕەنگێکـەو، لێکیـان دەدەن و دەڕێسـن تـا وات لێ دەکـەن سـەد خۆزگـە بخـوازی قسـەت لەگـەڵ نەکردنایە و، کێشەکەت هەر لای خۆت و، وەك خۆی بهێشتایەتەوە تا ئەوەندە ئاڵۆز نەکرایە..

دۆستی ڕاست ئەو کەسەیە بە ڕاشکاویی لەگەڵتدا بدوێت و، بـەبێ پێچ و پەنا خاڵە ئەرێیی و نەرێییەکانت خەڵات دەکات.

33

# وێستگەی سی و سێیەم

## ئاوێنە نهێنیت نادرکێنێت

وەك دیارە ئاوێنە نهێنیەکان لای کەس نادرکێنێت، نە بەرتیل و مولکی دونیا کاری تێ دەکەن، نە هەڕەشەو گوڕەشەی زۆردار و زلهێزان، با ئەو هەڕەشە و تۆقاندنەش بگاتە ئاستی لێدان و کوشتن و ورد ورد کردنیشی!!.

ئاوێنە نەك نهێنیەکان دەپارێزێت، بەڵکو لەو کاتەوەی کە نهێنییەکی پێ دەسپێریت لەبیری خۆی دەباتەوە.

مرۆڤی ڕاستگۆش -بە هەمان شێوە- گەر تاجی زێڕینی لەسەرکەی، یا هەڕەشەی کوشتن و بڕینی لێ بکەی، نهێنی کەسێکی دیکەت لا نادرکێنێت، با دوای زویر بوون و لە یەك بڕان و نەمانی پەیوەندی لەگەڵ کەسی پەیوەندیدار و خاوەن نهێنیەکەش بێت،

چونکە دەزانێت نهێنی ڕاسپاردەی خوایە و، بە هیچ شێوەیەك نابێت کەمتەرخەمی لە پاراستنیدا بکەی.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴾النساء: ٥٨.

واتە: بێگومان خوای گەورە فەرمانتان پێ دەدات کە گشت سپاردە و ئەمانەتەکان بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێننەوە و، هەرکات دادوەریتان لەنێوان مرۆڤەکاندا کرد دادپەروەرانە حوکم بدەن و دادوەری بکەن، چونکە بە بێگومان ئامۆژگاریی خوای گەورە زۆر جوان و چاکە، بەڕاستی خوای گەورە بیسەر و بینایە.

خۆشەویستیش دەفەرموێت: هەرکەسێك قسەیەك بکات و لابکاتەوە، ئەوە ئەمانەتە[1].

لە کۆنیشەوە وتراوە: سنگی مەردان گۆڕی نهێنییەکانە.

لەمە چاکتر و باشتر ئەوەیە لە بری ئەوەی سنگت بکەیتە گۆڕی نهێنی، نهێنییەکە لەبیر خۆت ببەیتەوە!.

---

١- عن جابر بن عبد الله، قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " إذا حدث الرجل بالحديث ثم التفت فهي أمانة " أخرجه أبو داود، كتاب الأدب، باب في نقل الحديث، والترمذي في جامعه،كتاب الذبائح، أبواب البر والصلة، باب ما جاء أن المجالس أمانة.

دەگێڕنـەوە دەڵـێن: دوو هـاوڕێ بەیەکـەوە بـوون، هاوڕێیـەکیان نهێنییەکی بەوی دیکەیان سپارد و، وتی: لەبەرت کرد؟! ئـەویش لـە وەڵامدا وتی: نەخێر، لەبیرم کرد!.

خۆشەویسـتیش ﷺ دەفـەرموێت: هـەر کـەس عـەیب و عـاری موسوڵمانێك داپۆشێت خوای گەورە لە دونیا و دواڕۆژدا عەیب و عاری دادەپۆشێت.[1]

ماوەردی -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێت: هەندێك نهێنیی خـۆت هەیـە ناتوانیـت لای هاوڕێیـەکی دڵسـۆز نەیـدرکێنیت، چـونکە پێویسـتت بـە ڕاوێـژکاریی و ئامۆژگـاریی دڵسـۆزێکە، بـەڵام دەبێـت بزانیت لای کام هاوڕێ دەیدرکێنیت و، بە کام هاوەڵ متمانە دەکـەیت و، لای کامیان گرێی دڵت دەکەیتەوە، چونکە مـەرج نییـە کەسـێك لـە پارەدا ئەمین بێت، لە پاراستنی نهێنیدا ئـەمین و متمانـەپێکراو بێـت، هـەروەها لەبەرئـەوەی پاراسـتنی پـارە زۆر ئاسـانترە لـە پاراسـتنی نهێنی دەبینین پارێزەرانی نهێنی زۆر کەمترن لە پارێزەرانی پارە.

---

١- (من ستر مسلما ستره الله في الدنيا و الآخرة) رواه أبو داود وابن ماجة وأحمد وابـن حبان عن أبي هريرة -رضي الله عنه-.

**هەندێ قسە و پەندی دانا و زانایان:**

لە سولەیمان پێغەمبەرﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی: با هاوڕێت زۆر بێت، بەڵام لەنێو هەزاریاندا یەك هاوڕێ بۆ پاراستنی نهێنییەکانت هەڵبژێرە.

زانای گەورەی شافعی مەزهەب (خەتیبی شەربینی) دەفەرموێت: ئەگەر مردووشۆر لەکاتی شۆردنی مردووەکەدا شتێکی دڵخۆشکەری لە مردووەکە بینی وەك زەردەخە و بۆنی خۆشی وا باشترە وەك هاندانێك بۆ خەڵکی کە ژمارەیەکی زیاتر نوێژی لەسەر بکەن و دۆعای خێری بۆ بکەن، ئەو هەواڵە خۆشە لای خەڵك باس بکات و، هەرکاتێك کارێکی ناخۆشی لێ بینی وەك ڕەشهەڵگەڕان و بۆگەنیی و شێواویی ڕواڵەتی بە هیچ شێوەیەك دروست نییە ئەم نهێنییە لای کەس بدرکێنێت، چونکە ئەم کارە بە غەیبەت هەژمار دەکرێت و، تازە ناتوانێ گەردن ئازایی لێ بکات.





عەمری کوڕی عاس -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: هەرکاتێك نهێنییەکی

خۆمم لای کەسێك درکاندبێت و ئەویش نـەیتوانیبێت بیپارێزێـت و لای خەڵکی درکاندبێتی، لە بـری لۆمـەکردنی ئـەو لۆمـەی خـۆمم کـردووە چۆن نەمتوانیوە لای خۆم بیپارێزم.

باوك و باپیرانیشمان لە دێر زەمانـەوە فەرموویانـە: قسـە کەوتـە زارێك دەکەوێتە شارێك.

## چیرۆکی مەسیح و حەوارییەکان:

مەسیح (سەلامی خوای لەسەر بێت) ڕوو لە حەوارییـەکان دەکـات و، ئەم پرسیارەیان ئاڕاستە دەکات:

هەڵوێستتان چی دەبێت گەر برایەکتان بـبینی خـەوی لێ کـەوتووە و، با جلەکانی لەسەر لا بردووە و، لەشی دەرخستووە؟

حەوارییەکان: دایدەپۆشین.

مەسیح: نەخێر، وا ناکەن، بەڵکو عەورەتـی دەردەخەن!.

حەوارییەکان: سبحان الله، چۆن وا دەکەین!!.

مەسـیح: هـەروەکو چـۆن کاتێـك کـارێکی خـراپ لـە برایـەکتان دەبیستن، ئەوەندەی دیکەی پێوە دەنێن و، بڵاوی دەکەنەوە!!

چیرۆکی عەبباس –مامی خۆشەویستمان– و عەبدوڵڵای کوڕی:

عەبباسی کوڕی عەبدولموتەللیب ئامۆژگاریی عەبدوڵڵای کـوڕی – خوا لێیان ڕازی لێ بێت– کرد و پێی فەرموو:

ڕۆڵە گیان، دەبینم عومەری کوڕی خەتتاب زۆر گرنگیت پێ دەدات و، دەتباتە کۆڕ و کۆمەڵی پیاوماقوڵان، بۆیە ئەم چەند ئامۆژگارییەم لێ وەربگرە:

١- هیچ نهێنییەکی نەدرکێنی.

٢- باسی خراپەی کەسی بۆ نەکەیت.

٣- قەت درۆت لێ نەبیستێ.

٤- سەرپێچی لە فەرمانی نەکەیت.

٥- خیانەتت لێ نەبینێت.

ئیمامی شەعبی -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- سەبارەت بەم خاڵانە دەیفەرموو: هەر یەك لەم خاڵانە لە هەزار خاڵ باشترە.

**پەندە شیعر:**

لەگەڵ کەسێ بووی، تووشی دەم قڕە
کارت بە پەردەی، نەبێ مەیدڕە
بۆیە پێت دەڵێم، مەدڕە پەردەی کەس
خۆت لە ژێر پەردە، عەیب و عارت هەس

# 34

## وێستگەی سی و چوارەم

# ئاوێنە لە تاریکیدا ئامۆژگاریت ناکات

کاتێك دەتەوێت سوود لە ئامۆژگاریی و ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی ئاوێنە وەر بگریت ئاگاداری ئەم خاڵانە بە:

**یەکەم: نابێت ئاوێنەکەت ببەیتە ژوورێکی تاریك، یا پەردەی بەسەردا دادەیتەوە، چونکە ئاوێنە لە تاریکیدا کاری خۆی ناکات.**

تۆش گەر ویستت سوود لە ئامۆژگاریی و ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی هاوڕێکانت وەربگریت، نابێت بیبەیتە جێگایەك نەتوانێت ئامۆژگاریت بکات.

**دووەم: دەرفەت بە ئاوێنە بدە ئامۆژگاریت بکات و، قسەی خۆی تەواو بکات. تۆش ئەی مرۆڤی دانا دەرفەت بە هاوڕێ و دۆستان و**

بڕواداران بده قسەی خۆیان بکەن و، زمانی ڕەخنەیان گریێ مەدە و، قەڵەمیان مەخنکێنە.

سێیەم: لە کاتی سەیرکردنی ئاوێنە چاوت دامەخە و، مەیبەستە.



گەر چاوت دابخەیت، یا ببەستیت، سوود لە ئامۆژگارییەکانی ئاوێنە وەرناگریت.

بەڵام ئەوەی جێی داخ و کەسەرە ئەوەیە زۆر کەس دەبینین کاتێك ئامۆژگارییەکیان دەکرێت، تەقەی سەریان دێت و، گوێی خۆیان کەڕ دەکەن، وەك ئەوەی هیچ ئامۆژگارییەکیان بەر گوێ نەکەوتبێ.

# 35

## وێستگەی سی و پێنجەم

# ئاوێنە پشتت لێ ناکات، مەگەر بە دەستی خۆت پشتی لە خۆت هەڵکەیت



خۆشەویستان؛ قەت لە تەمەنتاندا بینیوتانە لەکاتێکدا بەرەو ڕووی ئاوێنەکەتان ڕۆشتبن، بەلاّم ئاوێنەکەتان ڕووی وەرچەرخاندبێت، یا پشتی تێ کردبن؟!

کەسی بڕواداریش بە هەمان شێوە ڕووی خۆی وەرناچەرخێنێت

و، پشت لە هاوڕێیان و برا بڕوادارەکانی ناکات.

یەکێك لە خراپترین هاوڕێیانت ئەو کەسەیە لەکاتی تەنگانەدا پشتت تێ دەکات و، وەك ڕۆژێك یەکترتان نەناسیبێت و، نان و دۆیەکتان بەیەکەوە نەخواردبێت.



خۆشەویستمان -ڕۆحمان بە قوربانی بێت- دەفەرموێت: "لا تباغضوا، ولا تحاسدوا، ولا تدابروا، وكونوا عباد الله إخوانا، ولا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاثة أيام".[1]

---

١- صحيح البخاري - كتاب الأدب، باب ما ينهى عن التحاسد والتدابر - عن أنس بن مالك -رضي الله عنه.

با پێکەوە کەمێك لە خزمەتی ئەم فەرموودەیەدا بین و، ڕاستکردنەوەیەك بۆ تێگەیشتنمان لە وشەکانی بکەین.

لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێت پێغەمبەرﷺ مەبەستی ئەوە بێت: ڕقتان لە کەس نەبێت، حەسادەت و ئیرەیی بە کەس نەبەن، پشت لەیەك مەکەن و، هەمووتان بە برایەتی و تەبایی ببنە بەندەی خوا، دروست نییە بۆ کەسی موسوڵمان زیاتر لە سێ ڕۆژ برای موسوڵمانی نەدوێنێ. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم ڕاڤەیە بە باڵای فەرموودەکەدا کورت هەڵدێنێ، چونکە ئەمە ڕاڤەی (لا تبغضوا، لا تحسدوا، لا تدبروا)ە، نەك ڕاڤەی (لا تباغضوا، ولا تحاسدوا، ولا تدابروا)، چونکە ئەم وشانە لە زمانی عەرەبیدا لە بابی (مفاعلە)ن، کە بۆ (مشارکة) دێت، واتە: بە دوو کەس زیاتر دەکرێت.

ڕاڤەی تەواوی فەرموودەکە ئەمەیە: ڕقت لە کەسێك نەبێت ڕقی لێت بێ، ئیرەیی بە کەسێك مەبە ئیرەییت پێ ببات، پشت لە کەسێك مەکە پشتت تێ بکات، واتە، بە ڕق و ئیرەیی و پشت تێ کردن بەرەنگاریی ڕق و ئیرەیی و پشت تێ کردن مەبەرەوە.

# 36

## وێستگەی سی و شەشەم

# ئاوێنە هاوڕێتە لە دەستی خۆتی مەدە

ئاوێنە وەك ئاشکرایە هیچ دوژمنایەتییەکی لەگەڵ جەنابعالیتاندا نییە، بەڵکو دۆستێکی دڵسۆز و ڕاستگۆیە، دۆستی دڵسۆز و ڕاستگۆش لەم زەمانەدا بە دەگمەن هەیە و، لە هەناری شیرین دانسقەترە و، زۆر بە ئەستەم چنگ دەکەوێت، بۆیە تاوانێکی گەورەیە ئەو دۆستەی بە ئەستەم دەست کەوتووە بە ئاسانی لە دەستی بدەیت.



مرۆڤی عاقڵ و هۆشمەند لەبەر تاوانێك یا هەڵەیەك چاکەی چەند ساڵەی دوژمنی ناسڕێتەوە چ جای چاکەی هاوڕێ و دۆستی دێرینی گیانی بە گیانیی.

بۆیە وتراوە: لاوازترین کەس کەسێکە نەتوانێت هاوڕێ بەدەست بێنێت، لەو لاوازتر ئەو کەسەیە ئەو هاوڕێیەی کە بەدەستی کەوتووە لە دەستی بدات.

مرۆڤی دانا دەتوانێت نەك تەنها لە ڕاستیی و جوانیی هاوڕێکانی سوود وەربگرێت، بەڵکو لە هەڵەو تاوانەکانیشیان.

**بزانە:**

❋ ئەو لێدانەی ناتکوژێت بەهێزت دەکات.

❋ مەرج گشت هاتنەخوارەوەیەك خراپ بێت، ئەوەتا هاتنە خوارەوەی باران جوانترین دەستپێکە.

❋ هەموومان دەزانین مێز قاچی هەیە بەلاَم ناڕوات، دەزانین دەرگا دەستی هەیە، بەلاَم نامانەوێ تەوقەمان لەگەڵ بکات، دەزانین زۆر کەس هەن دڵیان هەیە، بەلاَم هەستمان پێ ناکەن، دەی دڵتەنگ مەبە.

❋ گەر بەشداریی غەمی کەسێك بیت ئەوە تۆ کەسێکی چاکی، بەڵام ئەگەر بەشداریی چارەسەریی غەمەکانی بیت ئەوە تۆ کەسێکی گەورەیت.

## حیکایەتێکی چینی:

ئافرەتێکی چینی لە یەکێك لە گوندەکانی چیندا هەموو ڕۆژێك بە دوو گۆزەوە سەردانی کانیی گوندی دەکرد و، هەردوو گۆزەی بە پڕکراوەیی هەڵدەگرت و بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە.

بەڵام، گۆزەیەکیان کوندار بوو، تا دەگەیشتە ماڵەوە نیوەی لە ڕێگادا دەڕژا و، بە گۆزە و نیوێك ئاو دەگەیشتە ماڵەوە.

دوای دوو ساڵ ماندووبوون و ڕەنج کێشان، ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیاندا ڕوویدا:



گۆزە کوناوییەکە بە دڵێکی پڕ کەسەر و، ڕەنگێکی زەردەوە:

من خەجاڵەتی تۆم، چونکە هاوڕێیەکی باش نەبووم و، نەمتوانی بە پێی پێویست –وەك گۆزەی هاوڕێم– خزمەتت بکەم، بەڵکو هەمیشە ڕەنجی تۆم بەفیڕۆ دەدا.

ئافرەتەکە بە زەردەخەنەیەکەوە: نەخێر ئازیزەکەم، وا خۆت زویر و پەرێشان مەکە، تۆ خزمەتێکی زۆر گەورەت کردووە، گەر باوەڕیش ناکەیت با بەیەکەوە بڕۆین سەیری لای چەپی ڕێگاکە بکەین.

کاتێك دەڕۆنە سەر ڕێگاکە، گۆزە کوناوییەکە سەیری لای چەپی ڕێگا دەکات و دەبینێت بووەتە دیمەنێکی دڵڕفێن و گوڵ و گوڵزار.

ئافرەتەکە دەست بە گۆزەکەدا دێنێت و پێی دەڵێت: من دەمزانی تۆ کونت تێدایە، بۆیە تۆوی جۆرەها گوڵی ڕەنگاوڕەنگم لە لای چەپەوە دەڕژاند و، بەو ئاوەی لە تۆوە دەڕژا تۆوەکان ئاو دەدران و، بوونە ئەو دیمەنە سروشتییە جوانەی کە دەیبینی، گۆزەی ئازیزم: ئێستە زانیت کە ئەو هەموو گوڵ و گوڵزارە بەهۆی کوونەکانی تۆوە بوو!

دڵی گۆزە بەم وشە شیرین و، دیمەنە جوانە زۆر خۆش بوو و، لەگەڵ ئافرەتەکەدا بە خەندە و پێکەنین بەرەو ماڵ گەڕانەوە.

# 37

## وێستگەی سی و حەوتەم

# ئاوێنە تووڕە نابێت

هەڵسەنگاندن و ڕادەربڕین وەك كاری دادوەریی وایە، مرۆڤیش لەكاتی تووڕەبووندا دەبێت خۆی لە كاری دادوەریی دووربخاتەوە و، لە دادوەریدا خۆی لە تووڕەبوون بپارێزێت، چونكە تووڕەیی بەرچاوی مرۆڤ ڕەش دەكات و، هەقیقەتەكانی لێ دەشێوێنێت.




كەسێك دێتە لای خۆشەویستﷺ و داوای ئامۆژگاریی لێ دەكات،

خۆشەویستیش پێی دەفەرموێت: (تووڕە مەبە) چەند جاری دیکە داوای ئامۆژگاریی لێ دەکات، بە هەمان شێوە پێی دەڵێت: (تووڕە مەبە).[1]

هەروەها قەدەغەی کردووە لەسەر دادوەر لەکاتی تووڕەییدا دادوەری بکات[2]، چونکە هۆش و بیر و عەقڵی لای خۆی نابێت و، ئەگەری زۆری ئەوەی هەیە لەو کاتەدا هەق نەبینێت و بە جوانیی بیرنەکاتەوە.

ئەگەر بە یاریی و خۆشەویستیەوە لە منداڵێك بدەیت، یاخود گازی لێ بگریت، پێدەکەنێت، بەڵام بە لۆمە و تووڕەییەکی کەم و چاو گرژکردنێك دەگریت و فرمێسك بە خوڕڕەم لە چاوەکانی دەبارێنێت، چونکە ئازاری دەروونی لە ئازاری لاشە سەختتر و بە ئازارترە.

---

١ – عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن رجلا قال للنبي صلى الله عليه وسلم: أوصني، قال: " لا تغضب " فردد مرارا، قال: " لا تغضب " صحيح البخاري – كتاب الأدب، باب الحذر من الغضب.

٢– حدثنا عبد الملك بن عمير، سمعت عبد الرحمن بن أبي بكرة، قال: كتب أبو بكرة إلى ابنه، وكان بسجستان، بأن لا تقضي بين اثنين وأنت غضبان، فإني سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول: " لا يقضين حكم بين اثنين وهو غضبان " صحيح البخاري – كتاب الأحكام، باب: هل يقضي القاضي أو يفتي وهو غضبان.

توڕەیی: ئەوەی بتوانێت تووڕەت بکات دەتوانێت بەسەرتدا سەربکەوێت.

کەسی تووڕە لەکاتی تووڕەییدا دەمی دەکاتەوە و، عەقڵی کلیل دەدات.

بە تووڕە بوون چرای بیرکردنەوە دەکوژێتەوە، زۆربەی کاتیش پەشیمانی بە دواوەیە، کەسی تووڕە دۆستانی زۆر کەمن.

تووڕە بوون لە بنەڕەتدا کارێکی سروشتیە، بەڵام دەبێت زوو کۆنترۆڵ بکرێت، بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆی بڕیاردانی نادروست و هەڵە، هەروەها زۆرجار دەبێتە هۆکاری تووشبوون بە نەخۆشی جۆراوجۆری وەك زیادبوونی ڕێژەی لێدانی دڵ و بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و پەستانی خوێن و جەڵتەی دڵ و دڵتەنگیی و خەمۆکیی و هەرس نەکردنی خواردن.

ئەمە جگە لە نەخۆشی لەبیرچوونەوە و، پیربوون و چرچ بوونی پێست و دەم و چاو و چەندین نەخۆشی دیکەش.

لەڕووی دەروونیی و جەستەییەوە زوو دەڕوخێن و بێ ورە دەبن، هەروەها تەمەنیشیان لە تەمەنی مرۆڤە ئارامەکان کورتترە.

بۆ چارەسەرکردن و کۆنترۆڵ کردنی تووڕەییت ئەم ڕێگا چارانە بگرەبەر:

١- كاتێك تووڕه بوويت دەسنوێژ بشۆ.[1]

٢- بـاری وەسـتان و دانيشـتنت بگـۆڕە، ئەگـەر بـە پێـوە بوويـت دانيشـە، ئەگـەر ئـارام نـەبوويت و، كـۆنترۆڵی تووڕەييەكـەت نـەكرد ڕاكشێ.[2]

٣- ئەو كەسانەی هەميشه هەست به تووڕەيی دەكەن ڕۆژانه وەرزش بكەن، هەروەها وێنەكێشـان و خوێندنـەوەی بابـەتی ڕۆحيـی و ئـارام بەخش و دڵخۆشكەر.

## سەرەداوێك:

كاتێـك نينۆكـەكانمان درێـژ دەبـن كورتيـان دەكەينـەوە و، زيادەكەيان دەبڕين، بەڵام پەنجەكانمان نابڕين، بەم شێوەيەش كاتێك

---

١- قال النبي صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ الْغَضَبَ مِنْ الشَّيْطَانِ وَإِنَّ الشَّيْطَانَ خُلِقَ مِنْ النَّارِ وَإِنَّمَا تُطْفَأُ النَّارُ بِالْمَاءِ فَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ) رواه أبـو داود, الأدب بـرقم ٤١٥٢، وأحمد,مسند الشاميين برقم ١٧٣٠٢.

٢- عن أبي ذر-رضي الله عنه- أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قـال: " إذا غضب أحدكم وهو قائم فليجلس، فإن ذهب عنه الغضب وإلا فليضطجع " صحيح ابن حبان - كتاب الحظر والإباحة- باب الاستماع المكروه وسوء الظن والغضب والفحش - ذكر الأمر بالجلوس لمن غضب وهو قائم والاضطجاع إذا كان جالسا.

گرفت و کێشەکانمان زیاد دەبن، پێویستە ئەوان ببڕین، نەک پەیوەندیەکانمان.



## حیکایەتێک:

کوڕەکەی هەمیشە تووڕە و ناوچاو گرژ و مۆن بوو، بەڵام لەدوای هەموو گرژیی و تووڕەبوونێک هەناسەی پەشیمانی هەڵدەکێشت و، دەیویست دڵە ڕەنجاوەکان ئاشت بکاتەوە، بەڵام لە گەڕانەوەی دۆخی جاران سەرکەوتوو نەدەبوو.

باوکی دانا و حەکیمی بە دانایی و حیکمەتی خۆی ویستی وانەیەکی تایبەت بە چەمکی تووڕەبوون و ئاشتکردنەوەی فێر بکات.

باوکی دڵسۆز و دانا داوای لە ڕۆڵەکەی کرد کە چەکوشێک و پاکەتێک بزمار ئامادە بکات و، هەرکاتێک تووڕە بوو بە چەکوشەکەی

دەستی بزمارێك بە دیواری باخچە پڕ لە گوڵ و گوڵزارەکەیاندا دابکوتێت.

ڕۆژ بە ڕۆژ ڕێژەی بزمارەکان زیادی دەکرد تا پاکەتەکە خاڵی بوو و، بینی دیمەنی دیوارەك زۆر ناشیرین بووە ئیتر وای لێهات هەست بە دەرئەنجامی نەرێی تووڕەبوونەکانی بکات و، کۆنترۆڵی خۆی بکات.

باوکی داوای لیٚ کرد بڕوا بزمارەکان لە دیوارەکە بکاتەوە.

دوای لێکردنەوەی بزمارەکان داوای لە کوڕەکەی کرد سەیری دیمەنی کوناویی دیوارەکەی بکات، ئەو کاتە پێی فەرموو:

ڕۆڵە گیان، هەموو تووڕەبوونێکت وەك ئەوە وایە بزمارێك بە دڵی باخچە ئاسای هاوڕێکانتدا بکوتیت، هەموو پەشیمان بوونەوە و پۆزش هێنانەوە و داوای لیٚ بووردن کردنێکت وەك ئەوە وایە بزمارێك دەربێنیت، بەڵام سەیری ئەو دیوارە بکە و، بزانە بزمارەکان چەند ئاسەواری ناشیرینیان لەدوای خۆیدا بەجیٚ هێشتووە و، دیمەنی گوڵەکانیان تێکداوە، تووڕەییەکانی تۆش بەهەمان شێوە لە دیواری دڵی هاوڕێکانت لەدوای لێبووردن ئاسەواری خراپ و ناشیرین بەجیٚ دێڵن و، ئەستەمە لەبیربرێتەوە.

## سێ حیکمەت:

**حیکمەتی یەکەم:** ڕەشەبا دەتوانێت پاپۆڕێك نقوم بکات، یا لەناو ببات، بەڵام ناتوانێت گرێیەکی بچووکیش بکاتەوە، تووڕەییش بە هەمان شێوە دەتوانێت دوو هاوڕێ جیابکاتەوە، یا شیرازەی خێزانێك بپچڕێنێت، بەڵکو دەتوانێت دوو هۆز، دوو شار، دوو وڵات لەیەك بدات و بەجەنگیان بێنێت، بەڵام ناتوانێت بۆ گرفتێکی بچووکیش بێت ڕێگا چارەیەك بدۆزێتەوە.



**حیکمەتی دووەم:** لە درەختێك دەتوانیت چەند ملیۆن دانە شقارتە دروست بکەیت، بەڵام بە یەك دانە شقارتە چەند ملیۆن درەخت دەسووتێنرێت. جا تۆش دەرفەت بە تووڕەیی مەدە پەیوەندییە سەوزەکانت بسووتێنێت.

**حیکمەتی سێیەم:** لە هەڵەکانت عارەقی خەجاڵەتی دەرمەدە و شەرم مەکە، چونکە تۆش مرۆڤیت، گشت مرۆڤێکیش هەڵە دەکات، بەڵام شەرم لە دووبارەکردنەوەیان بکە.

# 38
## وێستگەی سی و هەشتەم

# ئاوێنە، خۆی بە گەورە نازانێت و، لە خۆی بایی نابێت، و بە فیز و دەمارەوە ناتدوێنێ

کەس نکۆڵی لەوە ناکات کە ئاوێنە زۆر خاکییە و، خۆی بە گەورە نازانێت و، بە فیز و دەمارەوە ناتدوێنێ، بۆیە مرۆڤ لە بەردەمیدا هەست بە زەلیلیی و سەرشۆڕیی و کلۆڵیی ناکات.

مرۆڤی بڕواداریش دەبێت بە هەمان شێوە بێلاق (تواضع) بنوێنێت و، خۆی لە باقی بڕواداران بە گەورەتر نەزانێت.

خۆبەگەورەزانین واتە خەڵك بەبچووك زانین، هەموو خەڵك بەبچووكزانینێك لە خۆبەگەورەزانینەوە هەڵدەقوڵێت.



حیکمەتێك: چەندە خەڵکی بە بچووك بزانیت، ئەوەندە خەڵکیش بە بچووکت دەزانن، کەسێك لەسەر لوتکەیەکەوە سەیری خەڵکی بکات بە بچووکی دەیانبینێت، بەڵام بەهەمان شێوە خەڵکیش لە خوارەوە بە بچووکی دەیبینن.

هۆکاری سەرەکی خۆبەگەورەزانین و، بە سووك سەیرکردنی خەڵکی لەخۆباییبوونە.

لەخۆباییبوونە وا لە مرۆڤ دەکات خۆی بە زاناتر و، داناتر و، جوانتر بزانێت، وا هەست بکات هەمیشە لەسەر ڕاستە و، خەڵکی نەزان و گێل و پیس و پۆخڵ و ناشیرین و قێزەونن و، لەسەر هەڵەن و ئاگایان لە مەحموودی بێ زەواد نییە.



لەخۆبایی بوون دەستپێکی کۆتایی کەسایەتی مرۆڤە، هەر ئەوەندەی ڤایرۆسی لەخۆباییبوون کەلێنێك لە دەروونی مرۆڤدا دەدۆزێتەوە و جێگایەك بۆ خۆی گەرم دەکات، ئیتر ئەو مرۆڤە تەرازووی دادپەروەریی لەنگ دەبێت و، تووشی هەڵەی گەورە دەبێت و، ئەو پلەوپایە و متمانەی جاران هەیبوو لەدەست دەدات.

کەسی لەخۆبایی کەسێکە وا بیر دەکاتەوە کە جەنابیان چەقی بازنەن، خەڵکیش بە گشتی دەبێت بە چواردەوریاندا ماخۆلانیان بێت و، خۆیان بە قوربانی بکەن و، هەمیشە لەخزمەتیدا بن و چاوەڕێی فەرمانی جەنابیان بن.

گەر دەرکەوت لە بەری هەڵسن، گەر دیار نەبوو هەواڵی بپرسن، هاتەگۆ گشت گوێڕایەڵ بن.

لەخۆباییبوون لە ژیانی هاوسەرییدا دەستپێکی پچڕانی شیرازەی خێزانە. مێرد کاتێك خۆی لە هاوسەرەکەی بە گەورەتر زانی، دەرگای دیالۆکی ژن و مێردایەتی دادەخات و، وا دەزانێت ئەندامانی خێزانەکەی لەوە کەمترن پرس و ڕایان پێ بکات، تووشی هەڵە دەبێت و، کاڵەك بە ئەژنۆ دەشکێنێت. ژنیش خۆی بە جوانترین ژنی جیهان دەزانێت، بۆیە بە پێویستی نازانێت خۆی بۆ مێردەکەی بڕازێنێتەوە، چونکە مێردەکەی لەو جوانتر نادۆزێتەوە و دەبێت مەمنوونی بێت کە لای دەمێنێتەوە و پێی ڕازییە، مێردیش لە دەرەنجامدا لە دیمەنی ناڕێك و شپرزەی بێزار دەبێت و، هەمیشە چاوە چاویەتی و، دیمەنی ڕازاوەی ئافرەتێکی دیکە سەرنجی ڕادەکێشێت، کێشە و گرفت لەنێوان ژن و مێرددا پەرەدەسەنێت و ئەگەری جیابوونەوە زیاد دەکات.

لەخۆباییبوون نەخۆشییەکی کوشندەیە زیاتر تووشی کەسانێك دەبێت کە شانازی بە دەسەڵات یا زانست و ئاستی مەعریفی و زیرەکی، یا هەر جیاکەرەوەیەکی دیکە دەکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ لقمان: ١٨. ڕووت لە خەڵکی وەرمەگێڕە و، بە فیز و دەمارەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ، بەڕاستی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت خۆهەڵکێش و خۆبەگەورەزان و بەفیزن. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴾ الإسراء: ٣٧. بەسەر زەویدا بەفیز و دەمار و لەخۆباییبوونەوە مەڕۆ، چونکە هەرگیز ناتوانیت زەوی کون بکەیت و، قەت لە بەرزیدا ناگەیتە بالای بەرزی شاخەکان. مرۆڤ لە تافی لاوێتی و گەنجایەتیدا، زیاتر لە گشت قۆناغەکانی تەمەن هەست بە غورور و لەخۆباییبوون و، شانازی کردن بە خود و، گاڵتە و سوکایەتی کردن بە خەڵکی دەکات.

زۆرجار لەخۆبایی بوونی لاوان هۆکاری کەوتنە هەڵە و پەشیمانی و دواخستنی هەڵبژاردنی هاوسەری کوڕ و کیژە لاوەکانمانن، چونکە هەر کەس لەم لەخۆباییبووانە کەس بە شیاوی خۆیان نازانن و، خۆیان لە هەموو کەس بەرزتر و بالاتر دەزانن.

لە واقیعیشدا زۆر لە کیژانی کوردمان بینیوە بەهۆی لەخۆباییبوون و خۆبەگەورەزانینەوە کەوتوونەتە داوی قەیرەییەوە و،

لــه كــاروانى تەمەنــدا بــەجىّ مــاون و، كــەس پێيــان قايــل نابێــت هاوســەرگيرييان لەگــەڵ بكــات دواى ئــەوەى دەيــەها داواكارييــان هەبووە.

لەخۆباييبوون تەنها پەيوەست نييە بـە گروپـى لاوان و گـەنجانى خۆشەويستەوە، بەڵكو باڵى ڕەشى بەسەر پيرەمێرد و بەتەمەنەكانـدا دەكشێت، لەبيرى خۆيان دەبەنەوە كە تەنها لەخۆباييبوون بوو قوڕى بەســەر ئيبليســدا كــرد و مــاڵى وێــران كــرد و، بوويــە هــۆى نــەفرەتى پەروەردگار و، لە بەهەشت دەركردنى ئەبەدىى.

گەر سەيرى ژيانى پڕ بەرەكەتى خۆشەويست بكەينﷺ دەبينين: خۆى لە خەڵكى جيانەكردووەتەوە، نە بە جلوبەرگ، نە بە جىّ و ڕێ، دانيشتنى وەك دانيشتنى هاوەڵانى بووە، خـواردنى وەك خواردنيـان، خانووى وەك خانوويان، بەڵكو كەمتر و نزمتر و خـراپتريش، نەكۆشـك و تەلارى لە دواى خۆى بە جىّ هێشتووە و، نە لەسەر لوتكە و شاخ و جێگاى بەرز خانوو بەرە و باغ و باغات و مەزرەعەدا ژيانى بردووەتـە سەر.

لە كوێدا جێيەك بۆ دانيشت هەبوايە بـا لـە كۆتـايى مەجليسيشـدا بوايـە دادەنيشــت، چاوەڕوانى فــەرموو فــەرموو و، ســەرى مــەجليس نــەدەكرد، بۆيـە گـەر كەسـێك نەيناسـيايە نەيـدەزانى كـىّ سـەروەر و

سەردار و پێغەمبەرە، بە دەستی پیرۆزی خۆی خزمەتی میوانەکانی دەکرد، بە دەستی موبارەکی پێداویستییەکانی خۆی هەڵدەگرت.

بۆ ئەنجامدانی کارێك بۆ کەسێکی کۆیلە، بۆ ئەو جێگایەی بیوستایە لە گەڵیدا دەچوو.

**پەندە شیعر:**

خەڵکی مەدوێنە، بە فیز و دەمار
مەگەر لە لووتی فیل کەوتوویتە خوار!

**دانسقەیەك:**

چەند جامێك ئاو گۆزەیەك پڕ دەکەن، گۆزەش وا دەزانێت زەریایەکە، نازانێت چەند جامێکە لە زەریا.

**شیعر: (چوارینەکانی خەیام)**

پەندێکی منالەکەت بدە، مامەی پیر!
با بازی بە خاك و گڵ نەکا، ژیری بە بیر!
بێژنگی لە دەس دەرێنە، بەس دابێژێ
کەللەی سەری پاتشا و میر و وەزیر.

** ** **

بۆ گۆزە کڕین، دەچوومە لای گۆزە کەرێك
سەد گۆزە بە من پێکەنی، هەر یەك لە بەرێك

ئێمەی وەکوو خۆت ئەبەی، سبەینێ خۆشت
وەك ئێمە دەبی بە گۆزە، لای بێخەبەرێك
** ** **

گۆزێك لە دەستم شکابوو، ئەو گریا بۆم
خەم دات نەگرێ، منیش یەکێکی وەك تۆم
زۆر جار منیش وەکوو تۆ گۆزەم دەشکاند
تۆش ڕۆژێ دەبی بە گۆزە، دەشکێی وەك خۆم
** ** **

دیم گۆزە کەرێك قوڕی دەشێلا دوێنێ
دەنگێکم ئەبیست، باوکە کوڕی ئەدوێنێ
ڕۆڵەم، بەزەییت بە بابی خۆتدا نایە؟!
مەمشێلە بە قەو، بە هێمنی پێم لێ دانێ.!
** ** **

بۆ ئاوی شەوێ، گۆزە شکاوێك لامە
فرمێسکی وشك نابنەوە، بێ ئارامە
کەللەی سەری شاو، دەست و پلی دەروێشە
تێکەڵ بوە، نازاندرێ کامەی کامە؟!

شاعیری عەرەبیش دەڵێت:

ملأى السنابل تنحني تواضعا والفارغات رؤوسهن شوامخ

گوڵە گەنمە پڕەکان سەری بێ فیزی و بێ لا فیان دانواندووە، بۆش و خاڵیەکانیش سەریان بڵند و بەرزە.

**دیالۆکی مامۆستای بە فیز و قوتابی وریا:**

مامۆستایەك زۆر بە فیز و دەمارەوە قوتابیەکانی دەدواند و، شانازیی بە ئاستی بەرزی زانست و مەعریفەتییەوە دەکرد!!



قوتابییەکی وریا: مامۆستای بەڕێز، دەکری پرسیارێك بکەم؟

مامۆستا: بەڵێ، بە دڵنیاییەوە هەر پرسیارێکت هەبێ وەڵامەکەیت لای من دەس دەکەوێت.

قوتابی: قـەبارەی کەشکەشـانی (گەلـە ئەسـتێرەی) ڕێگـای کـا کێشان (مجره درب التبانه) لە چاو گەردووندا چەندە؟!

مامۆستا خـاڵێکی سـفری لەسـەر تەختـە ڕەشـەکە کـرد و، وتـی: قـەبارەی زەوی لـە چـاو گەردوونـدا وەك ئـەم سـفرەیە لـەم تەختـە ڕەشەدا!

قوتابی: ئەی قەبارەی زەوی لـە چـاو قـەبارەی گەلاکسـی (گەلـە ئەستێرەی) ڕێگای کا کێشاندا (مجرة درب التبانة).

مامۆستا لە ناو خاڵە سفرەکەدا بە نووکە دەرزیەکی ورد خـاڵێکی وردی کرد و، وتی: قەبارەی زەوی لە چاو قەبارەی گەلە ئەسـتێرەی ڕێگای کا کێشاندا لـەم نووکـە دەرزیـە زۆر زۆر کـەمترە لـە چـاو ئـەم خاڵە سفرەدا.

قوتابی وریا: مامۆستا گیان، پـێم نـاڵێی قـەبارەی جـەنابتان لـەو نووکە دەرزیەدا چەندە؟!

مامۆستا لـەم پرسـیارە واقـی وڕمـا و کـەمێك حەپەسـا و قـوڕگی وشـك بـوو، پـاش بێدەنگییـەك پـەیامی قوتابیەکـەی نرخانـد و، بـە سوپاسکردنەوە وتـی: بەڵێ، من هیچم، بەڵێ، من هیچم.!!

## ڕووداوێك:

لە یەكێك لە وێستگەكانی میترۆدا لـە شـاری بۆستنی ئـەمریكی، ژن و مێردێكی گوندنشین بە جلوبەرگێكی سادەوە دابەزین و، بـە بـێ مۆڵـەتی پـێش وەخـت بـەرەو نوسـینگەی سـەرۆكی زانكۆی هارفـارد بەڕێ كەوتن. خانمـە بەڕێوەبـەری نوسـینگەی جـەنابی سـەرۆك پێـی وتن: جەنابی سەرۆك زۆر سەری قاڵە و، بەم نزیكە دەرفـەتی بینینـی ئێـوەی نییـە. ژنـە گوندنشـینەكە بـەبێ یـەك و دوو كـردن پێـی وت: چاوەڕێ دەكەین. ژن و مێرد ماوەیـەكی زۆر چـاوەڕوان بـوون، بـەڵام بەڕێوەبەری نوسـینگە فەرامۆشـی دەكـردن، ژن و مێـرد بـە ڕۆحێكـی ئارامەوە بـەردەوام بـوون لـە چـاوەڕوانیی، ئـەم كـارەش بـووە هـۆی تووڕە بـوون و بێـزار بـوونی خـانمی بەڕێوەبـەر، بۆیـە خـۆی كـرد بـە ژووری جـەنابی سـەرۆكدا و داوای لێكـرد ئـەو ژن و مێـردەی لـە كـۆڵ بكاتەوە و، با بۆ چەند خولەكێكیش بێت لە گەڵیاندا دابنیشێت، دوای مشت و مڕێكی زۆر جـەنابی سـەرۆك بـە بێزارییـەوە قایـل بـوو. ژن و مێردەكە بە جەنابی سەرۆكیان ڕاگەیاند كە كوڕێكیـان لـەم زانكۆیـەدا قوتابی بووە، بەڵام لـە ڕووداوێكـدا گیـانی لـە دەسـت دا، بـۆ ئـەوەی ناوی كوڕەكەیان لەم زانكۆیەدا بمێنێتەوە ئەیانەوێت دیاریەكی بچووك بە زانكۆ پێشكەش بكەن.

سەرۆکی زانکۆ بە زمانێکی زبرەوە پێی وتن: ببورن، ئێمە ناتوانین بۆ هەر قوتابیەك پەیکەرێك یا کۆتالێك دروست بکەین.

ژنەکە لە وەڵامدا وتی: ئێمە پەیکەر و کۆتاڵمان ناوێت، دەمانەوێت باڵاخانەیەك بەناوی کوڕە جوانە مەرگەکەمانەوە بە زانکۆ پێشکەش بکەین.

سەرۆکی زانکۆ: بە چاوێکی سووك سەیری جلوبەرگە کۆن و دیمەنە گوندنشینیەکەی کردن و پێی وتن: کاکە، دەزانن باڵاخانەیەك چەندی تێ دەچێت؟! باڵاخانەکانی زانکۆی هارفەرد حەوت ملیۆن و نیو دۆلاری تێ چووە!

سەرۆك وای زانی بەم قسەیە میوانەکانی شۆك دەکات و پوولێکیان پێوە دەنێت. دوای بێدەنگیەك، ژنەکە ڕووی کردە مێردەکەی و پێی وت: بەڕێز ستانفورد، ئەگەر ئەمە خەرجیی دروستکردنی زانکۆیەك بێت، بۆچی ئێمەش ئەو بڕە پارەی بۆ ئەم زانکۆیەمان تەرخان کردبوو زانکۆیەکی سەربەخۆی نوێی پێ دروست نەکەین؟!!

مێردەکەیشی سەری لەقاند و ڕەزامەندی خۆی دەربڕی!

سەرۆکی زانکۆی هارفارد گاڵتەی بە قسەکانییان دەهات و، باوەڕی نەبوو کە دوو کەسی تەواو بن.

بەڵام ژن و مێرد بەرەو کالیفورنیا کەوتنەڕێ و، هەر لەوێ لە ساڵی ١٨٨٤ز زانکۆیەکی گەورەیان بەناوی خانەوادەکەیانەوە دروست کرد، زانکۆی (ستانفورد).!! ئەمە چیرۆکێکی بەرئاگردان نییە، بەڵکو ڕووداوێکی واقیعیە (مالکوم فوربز) دەیگێڕێتەوە و، تا ئێستاش ناوی یەکە یەکەی ئەو خێزانە بە دیوار و پایەکانی زانکۆکەوە هەڵکۆڵراوە.

زۆر گرنگە گومانی باش بە خەڵکی بەرین، تا بتوانین گوێیان بۆ بگرین و، لە ڕێگەی جلوبەرگ و ڕواڵەتەوە حوکمی خراپ بەسەر خەڵکیدا نەدەین.

**شیعری هەڵبژاردە:**

مەڕوانە بە ڕوومەت کەوا ئەمڕۆ گوڵی تاکی
بڕوانە سبەینێ کە لە نێو دامەنی خاکی
(هەردی)

گەر ڕەفیقت یاری صادق بێت چ باکی ڕێگەتە
گەر کەسی بەد خووت لە گەڵدا بێ جەهەننەم جێگەتە
(أمین فەیزی بەگ)

دوێنێ قەترەیێ خوێن بوویت و، ئەمڕۆکە کەفێ خاکی
بەنی ئادەم، کەری، گەر کەر نەبی بۆچ هێندە بێ باکی؟!
(شێخ ڕەزا)

39

## وێستگەی سی و نۆیەم

# ئاوێنە، تا زیاتر لێی نزیك ببیتەوە جوانتر و ڕوونتر و وردتر وێنەی خۆتت پیشان دەدات.

کاتێك لە دوورەوە سەیری ئاوێنە بکەیت، نازانیت وێنەی چی تێدایە، تا کەمێك نزیك دەبیتەوە وێنەی خۆتی تیادا دەبینیت، بەڵام تا لە ئاوێنەکەت زۆر نزیك نەبیتەوە وردەکاری وێنەکەت بۆ دەرناکەوێت و، نازانیت چ تۆز و گەردێك ڕواڵەتی گرتوویت، بۆ بینینی وردەکاری وێنەکەت دەبێت هەنگاو بەرەو خزمەتی ئاوێنە بنێیت و، خۆتی لێ نزیك بکەیتەوە.

هاوڕێی دڵسۆز و خۆشەویستیش هەتا زیاتر لێی نزیك ببیتەوە جوانتر و روونتر و وردتر سوود و قازانجت پێ دەبەخشێت و ئامۆژگارییت دەکات و، بەهاناتەوە دێت.

# 40

## وێستگەی چلەم

# ئاوێنە کەس ناترسێنێت

ئاوێنـە بـە هـیچ شـێوەیەك ناتـرسـێنێت، تـۆش -ئـەی بـڕواداری ئاوێنە ئاسا- با بە گاڵتەشەوە بێت دروست نییـە کـەس بترسـێنیت، بـەڵام بەداخـەوە دەبیـنین و دەبیـسـین هاوڕێیان تەنها بۆ ڕابـواردن و کـات بەسەربردن پەن بەسەر هاوڕێیـەکی لاوازیانـدا دێـنن و دەیدەنـە قاقـای پێکەنین.



دەگێڕنـەوە دەڵـێن: جارێکیان هەندێك لە هاوەڵانی خۆشەویست (خوا لێیان ڕازی بێـت) لـە گەشـتێکدا لـە

جێگایەکدا بۆ پشوودان لایاندابوو، هەندێکیان سەریان نایەوەو و خەویان لێکەوتبوو، هاوڕێی یەکێکیان بۆ ترساندنی هاوڕێیەکەی گوریسێکی گرتبوو بەدەستەوە و بەخشکەیی دەیهێنا بەسەر و ملی هاوڕێکەیدا، هاوڕێ نووستووەکەی ڕاچڵەکیی و وایزانی مارە، خۆشەویستیش ﷺ تووڕە بوو و فەرمووی: دروست نییە موسوڵمان موسوڵمان بترسێنێت.[1]

هەروەها دەفەرموێت: هەرکەسێك بڕوادارێك بەبێ هەق بترسێنێت، هەقە لەسەر خوای گەورە لە ترس و لەرز و ناخۆشی ڕۆژی دوایی دڵنیا و ئارامی نەکات، واتە بیترسێنێت.[2]

بەڵکو خۆشەویست ﷺ قەدەغەی کردووە چەك، یا ئاسن، یا هەر ئامێرێکی ئازاربەخش یا کوشندە لەسەر بڕوادارێك بەرز بکاتەوە و بیتۆقێنێ و دەفەرموێت: هەرکەسێك پارچە ئاسنێك لەسەر کەسێك

---

١- روى أبو داود في سننه- كتاب الأدب-باب من يأخذ الشيء على المزاح، عن عبد الرحمن بن أبي ليلى، عن أصحاب محمد صلى الله عليه وسلم أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لا يحل لمسلم أن يروع مسلماً).

٢- روى الطبراني في المعجم الأوسط- باب الألف- باب من اسمه إبراهيم، عن عبد الله بن عمر -رضي الله عنه- مرفوعا: (من أخاف مؤمنا بغير حقٍ كان حقاً على الله أن لا يؤمنه من أفزاع يوم القيامة).

بەرزبكاتەوە (واتە بۆ ترساندن، یا ئازاردان و كوشتن) فریشتەكانی خوا نەفرەتی لیٚ دەكەن با برای باوك و دایكییشی بیٚت، واتە با بۆ گاڵتەش بیٚت.[1]



---

١- روى مسلم في صحيحه- كتاب البر والصلة والآداب- باب النهي عن الإشارة بالسلاح إلى مسلم، عن أبي هريرة رضي الله عنه ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: ( من أشار إلى أخيه بحديدة، فإن الملائكة تلعنه، حتى يدعه وإن كان أخاه لأبيه وأمه).

# 41

## وێستگەی چل و یەکەم

# لە پشتەوە سەیری ئاوێنە مەکە..

گەر بتەوێ سوود و قازانج لە ئامۆژگارییەکانی ئاوێنە وەربگریت، تەشریف بەرە بەردەمی جەنابی ئاوێنە و، هەردوو چاوت بکەرەوە و، جوان جوان تەماشای بکە، چونکە ئاوێنە لە پشتەوە هیچ سوودێکت پێ نابەخشێت و، سەیرکردنی پشتی ئاوێنەش لەڕاستیدا کات بە فیڕۆدانە.

تۆش گەر دەتەوێت سوود و قازانج لە ئامۆژگاریی و ڕێنماییەکانی هاوڕێ دڵسۆزەکانت وەربگریت، دەبێت بەهەمان شێوە ڕووبەڕوویان ببیتەوە و، داوای ئامۆژگاریی و یارمەتییان لێ بکەیت.

# 42

## وێستگەی چل و دووەم

### تا ئاوێنەی زیاترمان هەبێت جوانتر و زیاتر جوانیی و ناشیرینییەکانمان بۆ دەردەکەوێت..



لە ڕێگەی دوو ئاوێنەوە یەکێکیان لە پێشەوە و ئەوی دیکەیان لە دواوە پشتی خۆمان دەبینین.

ئاوێنەکانی ڕاست و چەپیشمان ئەملاو لامان پیشان دەدەن.

هاوڕێی چاکیش بە

هەمان شێوە، ئەوەی بە دوو هاوڕێ دەکرێ بە یەك هاوڕێ ناکرێ، ئەوەی بە سێ هاوڕێ دەکرێ بە دوو هاوڕێ ناکرێ.

بۆیە دەبێت هاوڕیکانمان زیاد بکەین، زیادکردنی هاوڕێکانمان تەنها لەڕێگەی متمانە دروستکردن و چاندنی تۆوی خۆشەویستیمانە لە دڵیاندا.

بۆ ئەم مەبەستەش –وەك دیل کارینجی لە پەرتووکە ناودارکەیدا کە بەناوی (چۆن هاوڕێ بەدەست دێنیت و، کاریگەریت لەسەر خەڵکی دەبێت) (How to Win Friends and Influence People) دەڵێت– ئەم چەند هەنگاوە بگرە بەر:

– گرنگیدان بە کەسی بەرامبەر.

– زەردەخەنە و پێکەنین بە ڕوویاندا.

– لەبەرکردنی ناوی بەرامبەر زۆر کاریگەریی ئەرێیی لەسەر دەروونی بەرامبەر هەیە.

– جوان گوێ بۆ بەرامبەرت بگرە.

– باسی ئەو کارانە بکە کە ئەو بەهەند وەریاندەگرێت و گرنگیان پێ دەدات.

– وا لە بەرامبەرت بکە کە هەست بکەن لای جەنابتان زۆر گرنگ و بە بەها و ئەرزشن.

# 43

## وێستگەی چل و سێیەم

# ئاوێنە تا دڵنیا نەبێت حوکم نادات

ئاوێنە تا دڵنیا نەبێت و بە چاوی خۆی نەبینێت حوکم نادات.

مرۆڤی بڕواداریش بە هەمان شێوە بە وتی وتیان باوەڕ ناکات و، تا دڵنیا نەبێت حوکم نادات.




بۆیە لە کاتێکدا دوژمنانی زەمانی خۆشەویستﷺ مقۆ مقۆیانە و قسەی درۆ بەدەم بڕوادارانەوە هەڵدەبەستن، خوای گەورە لۆمەی بڕواداران دەکات کە گوێیان بۆ دەگرن و، دەفەرموێت: ﴿وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ﴾ التوبە: ٤٧

وه له ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ الإسراء: ٣٦

بەدووی شتێك مەكەوە كە هیچ زانیارییەكت دەربارەیەوە نییە، چونكە بە ڕاستی گوێ و چاو و دڵت لێی بەرپرسیارن.

ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ كە بە درۆزن ناوزەد بكرێت، هەرچی ببیسێت بڵاوی بكاتەوە.[1]

مەرج نییە ئەوەی دەیبیسیت ڕاست بێت.

لە بەر ئەمەیە زانایانی فەرموودە لە وەرگرتنی فەرموودەدا زۆر توند بوون و چەند مەرجێكی سەختیان بۆ وەرگرتنی فەرموودە داناوە.

چونكە مەرج نییە ئەو كەسەی مرۆڤی چاك بێت هەڵە نەكات و گشت هەواڵەكانی ڕاست و حاشا هەڵنەگر بن.

كەسی وا هەیە ڕاستگۆ و دادپەروەر و لە خوا ترسە، بەڵام نازانێت چۆن هەواڵ وەربگرێت و چۆن بیگێڕێتەوە.

---

١- روى مسلم في صحيحه- باب النهي عن الحديث بكل ما سمع عن أبي هريرة -رضي الله عنه- قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " كفى بالمرء كذبا أن يحدث بكل ما سمع ".

بۆیە دەبینین کەس نکۆڵی لە چاکیی کەسانێکی وەك زوهری و حەسەنی بەصری و هتد نەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا لە گێڕانەوەی فەرموودەدا بە لاوازیان زانیون.

بۆیە دەبێت مرۆڤی بڕوادار لە ئەنجامدانی کارەکانیدا دڵنیا بێت و، بە جوانیی و تەواویی ئەنجامیان بدات.

پەروەردگاریش کەسێکی خۆشدەوێت هەرکارێکی کرد بە جوانیی و تۆکمەیی ئەنجامی بدات.

**پەندێکی یابانیی:**

لەبەر بزمارێك ناڵێك کەوت. !

لەبەر ناڵێك ئەسپێك کەوت. !

لەبەر ئەسپێك سوارێك کەوت. !

لەبەر سوارێك وڵاتێك وێران بوو. !

هەمووی ئەوانەش بەهۆی کەسێکەوە بوو کە بزمارەکەی بە جوانیی لەناڵەکە نەکوتابوو. !

بۆیە ئەرکی سەرشانی هەموانە ئەو کارانەی دەیکەین بەباشی ئەنجامی بدەین، چونکە ئەگەر بێت و ناتەواویەکی تێدا ئەنجام بدەین لە وانەیە بە زەرەرێکی زۆر و چاوەڕوان نەکراوەوە تەواو ببێت.

# 44

## وێستگەی چل و چوارەم

# ئاوێنە گشتاندن نازانێت

ئاوێنە تەنها حوكم بەسەر ئەو كەسانەدا دەدات كە هاتوونەتە بەردەمی، بۆیە ناتوانێت حوكمێكی گشتی بۆ خەڵكی دەركات.

هەروەها لەبەر جوانی ئەندامێكت یان ناشیرینیی ئەو ئەندامەت حوكم بەسەر هەموو ئەندامەكانی لەشتدا نادات و، ناڵێت: گشت ئەندامەكانی لەشت جوانن یان ناشیرینن. !

بۆیە كاتێك گەرد و تۆزێك بەسەرتەوە دەبینێت حوكم بەسەر هەموو لەشتدا نادات، بەڵكو تەنها تۆز و گەردی سەر سەرت پیشان دەدات و، ناڵێت: گشت لەشت تۆز گرتوویەتی.

وە لەبەر تەنها جوانیی چاوت ناڵێت: هەموو ئەندامەكانی لەشت جوانن، بەڵكو تەنها شایەتیی و گەواهیی جوانی چاوت بۆ دەدات.

مرۆڤی بڕواداریش خۆی له گشتاندن زۆر دوور دهگرێت، ناتوانێت لهبهر ههڵوێستی خراپی عهرهبێك بڵێ: گشت عهرهب خراپن، یاخود لهبهر ههڵوێستی چاکی کوردێك بڵێ: گشت کوردێك باشه، یا گشت موسوڵمانێك باشه و گشت گاور و جولهکهیهك خراپه.

ئهوهتا خوای گهوره کاتێك باسی گاور و جولهکهمان بۆ دهکات دهفهرموێت: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ آل عمران: ١١٣

واته: گاور و جولهکه وهك یهك نین و یهکسان نین، دهستهیهك له ئههلی کتاب شهو نوێژ دهکهن و، له شهودا ئایهتهکانی خودا دهخوێننهوه و، بۆ خودا سوژده دهبهن.

یاخود دهفهرموێت: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَائِمًا﴾ آل عمران: ٧٥ .

واته: دهستهیهك له ئههلی کتاب ههن ئهگهر ماڵ و دارایییهکی زۆری به ئهمانهت لا دانێیت به بێ خیانهت بۆت دهگهڕێنێتهوه، ههشیانه ئهگهر دینارێکی لا دانێیت بۆت ناگێڕێتهوه مهگهر بهسهریهوه وهستابیت و واز له مافی خۆت نهیهنیت.

45

## وێستگەی چل و پێنجەم

# ئاوێنە بە پاڵپشت بە هێزی پشتەوەی کارەکانی دەکات

دەبینین ئاوێنە لە پێشەوە جوانی و ناشیرینیمان پیشان دەدات، هۆکاری توانایی پیشاندانی ئاوێنەش ئەوەیە لە پشتەوە بە ڕەنگێك داپۆشراوە، واتە ئەو ڕوو پۆشەی پشتەوەی هێزی پیشاندانی پێبەخشیوە، کەواتە ئاوێنە بە هۆی پشت بەستن بەو ڕەنگ و ڕوو پۆشەی دواوە دەتوانێت کاری خۆی بکات.

مرۆڤی بڕواداریش مێژوویەکی دێرین و زێڕینی پڕ کەسانێکی زانا و دانا و پاڵەوان و مەرد و زمانپاك و دڵپاکی هەیە و، وەك قوتابیی و خوێندکارێکی بە ئەمەك و زیرەك بە پشتبەستن بە ئەزموون و هەڵوێستی جوانیانەوە کار دەکات.



پـــەروەردگاریش باســـی پێغەمبـــەرانی پێشـــتر دەكـــات و، بـــە خۆشەویستیش دەفەرموێت:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴾ الأنعام: ٩٠

ئەوانە ئـەو كەسـانەن كـە خـودا ڕێنمـوویی كـردوون، تـۆش ئـەی (محەمەدﷺ) شوێن هیدایەت و ڕێنموورییەكانی ئەوان بكەوە.

هەروەها پەروەردگارمان لە سـورەتی (تـەحریم)دا داوا لـە گشـت بڕواداران دەكات بەمێژووی پڕ شكۆی دوو ئافرەتـەوە شـانازی بكـەن و، شوێنی هەڵوێستی جوان و بلیمەتانەی بڕوادارییـان بكـەون و، ئـەو

دوو ئافرەتە بکەنە مامۆستا و پێشەوا و ڕابەریان، کە بریتین لە (خاتوو ئاسیەی هاوسەر و خێزانی فیرعەونی دیکتاتۆر) و (خاتوو مەریەمی کیژی عیمران).

﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ﴾ التحريم: ١١ — ١٢

هاجەرە خاتوونیش بووەتە پێشەوا و مامۆستای مرۆڤایەتی، بۆیە گشت بڕوادارێك بە پێغەمبەرانیشەوە گەر بیانەوێ مەراسیمی حەج و عەمرە بەجێ بێنن دەبێت پێ بەپێی ئەو خانمە خواناسە بڕۆن و، سەعی سەفا و مەروە بکەن.

هەر میللەتێك واز لە مێژووی زێڕینی خۆی بێنێت و، چەند کەسانێکی وەك مامۆستا و پێشەوا و ڕابەر بۆ خۆی دانەنابێت میللەتێکی هەمیشە دواکەوتوو و، بەرشەق و ڕەحمەتی بێگانە دەبێت.

# 46

## وێستگەی چل و شەشەم

# ئاوێنە لە کارەکەی بێزار نابێت

ئاوێنە بە بەردەوام کاری خۆی ئەنجام دەدات و، ئەگەر لە هەر چرکەیەکدا مرۆڤێك و لە هەر خولەکێکدا (٦٠) مرۆڤ و، لە هەر کاژێرێکدا (٣٦٠٠) مرۆڤ و، لە هەر ڕۆژێکدا (٨٦٤٠٠) کەس بڕۆنە خزمەتی بێزار نابێت.



بەڵکو ئەگەر یەك مرۆڤ ڕۆژانە هەزارەها جار بڕواتە بەردەمی و، داوای خزمەتی لێبکات بەبێ بۆڵە بۆڵ و بێزاریی دەربڕین کار و خزمەتی خۆی پێشکەش بە

میوانانی دەکات.

مرۆڤی بڕواداریش هەرچەندە ناتوانێت بەو شێوەیە خزمەت بکات و، لە توانایدا نییە بەرامبەر ئەو کەسە زۆرانە کار بکات، بەڵام دەبێت تا لە توانایدا هەبێت بە هەڵەداوان هەوڵبدات بێزار نەبێت و، سوود و قازانج و خزمەتی بە خەڵکی پێشکەش بکات، چونکە مرۆڤی بڕوادار لەبەر ئەوەی بازرگانیی لەگەڵ پەروەردگاریدا دەکات هیچ کارێکی بێ بەرانبەر و سوود و قازانج نییە، بەڵکو ڕێژەی سوود و قازانجی دە بەرانبەر و سەد بەرانبەر و هەزار بەرانبەر و زیاتریشە و، بەهیچ شێوەیەك ئەگەری زەرەر و زیانی نییە.

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾فاطر: ٢٩

بەڕاستی ئەوانەی پەیامەکەی خودا دەخوێننەوە و، نوێژەکانییان بەجوانی ئەنجامداوە و، لەو ڕزق ڕۆزییەی پێمانبەخشیون خێر و سەدەقە بە نهێنیی و ئاشکرا دەکەن، چاوەڕێی بازرگانیەکن کە هیچ نائومێدیان ناکات و، زەرەر و بڕانەوەی بۆ نییە.

47

## وێستگەی چل و حەوتەم

# ئاوێنە، هەرجارێك بڕۆیتە خزمەتی هەڵسەنگاندنی نوێت بۆ دەكات



بەرناردشـــۆ دەڵێـــت: بەرگدرووی ژێر تـەنها كەسێكە پێـوەرێكی باشـی هـەبێت بـۆ هەڵسـەنگاندن، چـونكە هـەموو جارێـــك بڕۆمـــــە لای ئەندازەگیریەكی نوێم بۆ دەكات، بەپێچـەوانەی خـەڵكانی تـرەوە كــە هـــەر لەســەر پێوانــە و ئەندازەگیرییە كۆنەكان دەڕۆن.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت: کـە مرۆڤـەکان هەمیشـە سـەیری ڕابردووی مرۆڤ دەکەن و، هەڵسوکەوتێکی خراپی پێش دەیەهاساڵی کەسێك دەکەنە سەنگی مەحەك بۆ حوکمدان بەسەر ئەو کەسەدا، ئیدی بیر لەوە ناکەنەوە کە ئەم کەسە هەنگاوی چاکی بەرەو چاکسازیی ناوە و، تەوبەی لەو کارە خراپەی کردووە و، ئێستا جێ پەنجەی سەوزی بەئاشکرا لە کۆمەڵگادا دیارە.



**شایەتحاڵێك:**

لـە زیندانـەکانی جیهانـدا بەگشـتی و زیندانـەکانی کوردسـتانی ئـازیزدا بەتایبـەت- چـەند ئـافرەتی لەشـفرۆش هەیـە، بـەڵام ئێسـتا

تەوبەیان کردووە و، بوونەتە کەسانێکی داوێنپاکی لەخودا ترس، بەڵام ئەوەی جێی داخ و کەسەرە ئەوەیە ئەگەر کاتی یاسایی زیندانیشیان تەواو بکەن بەتەمانین زیندان چۆڵ بکەن، چونکە کۆمەڵگە ڕەحمیان پێناکەن و، بە هەمان چاو تەماشایان دەکەن، لە لایەکەوە ترسی کوشتنیان لەلایەن کەسوکاریانەوە هەیە و، لەلایەکی دیکەوە ترسی ئەوەیان هەیە گورگەکانی کۆمەڵگا وازیان لێنەیەنن و، دەسدرێژیان بکەنە سەر.

لەکاتێکدا لەدیدیی ئیسلامدا ئەرکی سەرشانی دەوڵەمەندەکانە بە مەبەست چاکسازیی گوناهباران بڕێك لە سەروەت و سامانیان بۆ یارمەتی ئەو گوناهبارانە تەرخان بکەن.

ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە: پیاوێك بڕیاریدابوو کە شەو خێرێك بکات، بەڵام نەیزانی خێرەکەی گەیاندە دەست ئافرەتێکی لەشفرۆش، خەڵکی بۆ بەیانی بەسەرسوڕمانێکەوە دەیانگوت: ئەمشەو خێرێك بە لەشفرۆشێك کراوە، پیاوە خێرۆمەندەکە وتی: سوپاس بۆ خوا لەسەر لەشفرۆشێك. بۆیە بڕیاریدا خێرەکەی دووبارە بکاتەوە، بەڵام نەیزانی خێرەکەی گەیاندە دەست دەوڵەمەندێك، بۆ بەیانی خەڵکی بەسەرسوڕمانێکەوە دەیانگوت: ئەمشەو خێرێك بە دەوڵەمەندێك کراوە، پیاوە

خێرۆمەندەکە وتی: سوپاس بۆ خوا لەسەر دەوڵەمەندێك، بۆیە بڕیاریدا خێرەکەی سێبارە بکاتەوە، بەڵام نەیزانی خێرەکەی گەیاندە دەست دزێك ، بۆ بەیانی خەڵکی بەسەرسوڕمانێکەوە دەیانگوت: ئەمشەو خێرێك بە دزێك کراوە، پیاوە خێرۆمەندەکە وتی: سوپاس بۆ خوا لەسەر لەشفرۆشێك و دەوڵەمەندێك و دزێك، بۆیە لە غەیبەوە پێی وترا: خێرەکەت وەرگیرا، لەشفرۆشەکەیش بەڵکو بگەڕێتەوە و تەوبە بکات و ببێتە ئافرەتێکی داوێنپاك، دەوڵەمەندەکەیش بەڵکو پەند وەربگرێت و خێر بکات، دزەکەش بەڵکو واز لە دزی بێنێت.[١]

---

١- روى البخاري في صحيحه- كتاب الزكاة- باب إذا تصدق على غني وهو لا يعلم، ومسلم في صحيحه - كتاب الزكاة- باب ثبوت أجر المتصدق: عن أبي هريرة- رضي الله عنه-، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: " قال رجل لأتصدقن الليلة بصدقة، فخرج بصدقته فوضعها في يد زانية، فأصبحوا يتحدثون تصدق الليلة على زانية، قال: اللهم، لك الحمد على زانية، لأتصدقن بصدقة، فخرج بصدقته فوضعها في يد غني، فأصبحوا يتحدثون: تصدق على غني، قال: اللهم، لك الحمد على غني، لأتصدقن بصدقة، فخرج بصدقته فوضعها في يد سارق، فأصبحوا يتحدثون: تصدق على سارق، فقال: اللهم، لك الحمد على زانية، وعلى غني، وعلى سارق، فأتي فقيل له: أما صدقتك فقد قبلت، أما الزانية فلعلها تستعف بها عن زناها، ولعل الغني يعتبر فينفق مما أعطاه الله، ولعل السارق يستعف بها عن سرقته " .

# 48

## وێستگەی چل و هەشتەم

# ئاوێنە کەس ناگۆڕێت

ئاوێنە تەنها جوانیی و ناشیرینیەکانت بۆ دیاری دەکات، بەڵام قەت ناتگۆڕێت، نەجوانیت دەشێوێنێت و، نە ناشیرینیت جوان دەکات.

مرۆڤی هۆشمەند و عاقڵیش دەزانێت تەنها کەسێك توانای گۆڕانی خودی کەسەکانی هەبێت خودی کەسەکانن، تەنانەت پەروەردگاریش هەرچەندە توانای گۆڕینی کەسەکانی هەیە بەڵام کەس ناگۆڕێت، بەڵکو گۆڕینی کەسەکانی داوەتە دەست خۆیان، ئەوەتا لە سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ الرعد: ١١

واتە: بەڕاستی خودا بارودۆخ و حاڵی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت هەتا ئەوەی لە دەروونیاندایە نەیگۆڕن.

کەواتە گۆڕینی خودا بۆ کەسەکان پەیوەستە بە گۆڕینی خودی کەسەکانەوە.

ئەمەش نهێنی ئەو پرسیارەمان بۆ دەدرکێنێت کە زۆربەی موسوڵمانان ڕوویەڕووی دەبنەوە، ئەویش ئەوەیە: بۆ پەروەردگار دۆعاو نزا و پاڕانەوەی زیاتر لە سێ ملیۆن حاجی ڕۆژی عەرەفە بۆ سەرخستنی موسوڵمانان و شکست پێکردنی زاڵمان و کافران قبوڵ ناکات.

بۆ قنوت و پاڕانەوە شەوانی پیرۆزی مانگی ڕەمەزان و بەتایبەت شەوانی قەدر قبوڵ ناکات، کە تیایدا مامۆستایانی ئایینی و نوێژخوێنانی بەچاوی پڕ فرمێسك و دڵی بەکوڵەوە پێکەوە هاوار دەکەن: خوایە موسوڵمانان بەسەر دوژمناندا سەرخەیت، خوایە زاڵمان لەناوبەریت، خوایە تەفروتونایان کەیت، خوایە، خوایە، خوایە. ! !

لەوەڵامدا دەردەکەوێت کە دەبێت ئێمە لەگەڵ پاڕانەوەماندا بە هیممەت و هەوڵ و بیر و پلانی خۆمان هەوڵبدەین زاڵم لەناوبەرین و، بەرەنگاریی دوژمن ببینەوە، ئەوەتا پەروەرگارمان دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴾ محمد: ٧

ئەی بڕواداران، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لەئاین و بەرنامەی خودا بکەن و هەوڵی سەرخستنی بدەن، خوداش پشتتان دەگرێت و سەرتان دەخات.

هەروەك چۆن ناکرێت قوتابی لەبری خوێندن و خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە تەنها سەرقاڵی داوا لە مامۆستا کردن بێت کە دەریچێنێت و بڕوانامەی دەرچوونی پێببەخشێت، چونکە مامۆستا ئەگەر ئەو کارە بکات ئەوە گەندەڵە و، یەکسانیی و دادپەروەریی پێشێل دەکات و، جیاوازی نێوان قوتابی خاوەن هیممەت و کۆششی زۆر و دەوامی بەردەوام و، قوتابی تەممەڵ و بێ هیممەت و بێ کۆشش ناکات.

بەڕاستی مرۆڤەکانیش زۆر جار داوای گەندەڵیی لە پەروەردگار دەکەن کاتێك بەبێ هەوڵدان داوای سەرخستنی لێدەکەن، بەبێ ئەوەی بزانن کە داوای گەندەڵیی دەکەن و، هەرکاتێك پەروەردگار کارەکەیان بۆ ئەنجام نەدات وادەزانن خودا پشتی لە موسوڵمانان کردووە.

ناکرێ تەنها بەفرمێسکی پاڕانەوە و، خوێندنی قورئان و، شەونوێژکردن بەرانبەری تۆپ و زرێپۆش و مووشەك و هێزی دوژمن

ببینــەوە، چـونکە ئـەو کاتــە داوای تێکـدانی سـوننەتە نـەگۆڕەکانی خودای گەورە دەکەین کە تیایدا بۆ سەرکەوتن چەند مەرجێکی دیاری کــردووە، وەك ئامــادەکردنی چــەك و هێــزی شــیاو و هاوشــێوە و باشتریش لە چەکی دوژمن وەك دەفـەرموێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾ الأنفال: ٦٠



## قسەیەکی جوان:

ئەگەر هێشتاش بەدوای کەسێك دەگەڕێیت ژیانت بگۆڕێت... بڕۆ سەیری ئاوێنە بکە.
واتە: ئاوێنە خۆت پیشان دەدات و، پێت دەڵێت: ئەوکەسەی توانای گۆڕینی تۆی هەیەو، تۆش بەدوایدا ویڵیت: خۆتیت، چونکە تەنها خۆت دەتوانی خۆت بگۆڕیت.

**تا دیدارێکی دیکە**

**دۆعا لەمن و بەرەکەتیش لە خودا..**



# پێڕست




# فەلسەفەی ئاوێنەبوون

## چۆن دەبیتە ئاوێنە و، کێ دەکەیت؟

خوێنەری هێژا، ئەم پەرتووکە گوزەرێکە بەنێو ناوەڕۆك و سیفەتەکانی (ئاوێنە)دا و، بە چەمکی (ئاوێنەبوون) و (بەئاوێنەکردن) ئاشنات دەکات.
هەروەها هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی ئەو دەقە شیرینەی پێغەمبەرمان ﷺ، کە تێیدا بڕواداری بە (ئاوێنەی بڕوادار) چواندووە.
گەر تۆش دەتەوێت خۆت و کەسانی دەورت باشتر و چاوکراوانەتر بناسیت و کەسێکی شایستەبیت بۆ هاوڕێیەتیکردن و، کەسانی گونجاو و شیاویش وەك هاوڕێت هەڵبژێریت، ئەوا بفەرموو لەم سەفەرەدا هاوگەشتمان بە ..

0-0164-0000-3



9 780016 400001

نرخی (٤٠٠٠) دینارە